• زمانی تاوان هاته قسه
• شه پۆل فاخیر مێرگه سۆری
• سلێمانی،١٩٩٧،چاپی یه که م
• تیراژ:١٠٠٠دانه
• ژماره ی سپاردن به کتێبخانه ی نیشتمانی(٤)ی سالی ١٩٩٧

## پێشکەشە بە:

* دایکی خۆشەویستم کە لە باخچەی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی گەورەی کردم.
* ئەو کەسەی کە لە یادی ناکەم
* براکانم ئاراس و هەندرێن
* ئەو کەسانەی کە گیانی باوکم لە ناخیاندا بەدی دەکەم.

پێشه کی :ـ

ڕه نگه نووسینه وه ی مێژووی کاره ساتێکی پڕ تراژیدیا کارێکی ئاسان نه بێت ، به تایبه تی ئه گه ر لایه نه نهێنی و شاراوه کانی ئه م کاره ساته زیاترین له لایه نه دیاره کانی ...

زۆرجار مێژوو کاره ساتی گه وره ی له قورگی نهێنی یه کانیدا قووت داوه و ئاسه واری نه ماوه ، زۆرجاریش کاره ساته که له قاوغی ترس دا ماوه ته وه و که س نه یوێراوه تخوبه کانی ببه زێنێ . قه تلوعامی بنه ماڵه ی حه مه د ئاغای مێرگه سوری له و کاره ساته تراژیدیانه یه که بۆ ماوه یه کی زۆر له قاوغی ترس دا مایه وه و که س نه یوێرا، تخوبه که ی ببه زێنێ ، له به ر ئه وه ی نا، که له ناو کوردا نوسه ری بوێرو ئازا نه بوون ، به ڵکو له ترسی ئه وه ی نه وه ك ده ستی بێ به زه یی بنه ماڵه ی بارزانی بیان گاتێ ...

دوای فره حزبی له کوردستان و نه مانی تاك ده سه ڵاتی بنه ماڵه ی بارزانی ، ده رفه تی ئه وه هاته پێشه وه ، که په رده له سه ر ڕازو لایه نه شاراوه کانی ئه و کاره ساته لابرێ و زۆربه ی نهێنی یه کانی ئاشکرا بکرێن ، به ڵام هێشتا هه موو لایه نه کانی ئه و کاره ساته ڕوون نه بۆته وه و حه قی خۆی پێ نه دراوه ، ئه گه رچی دوای هه ره سی شۆڕشی ئه یلول له ساڵی ١٩٧٥دا، ژماره یه ك ڕووناكبیرو نووسه ری كوردو بیانی گوزه ریان به سه ر ئه و كاره ساته دا كردووه ، به ڵام له دوای ساڵی ١٩٩٤ه وه نووسینی زیاترێ له سه ر بڵاو بۆته وه و له ڕۆژنامه كانی كوردستانی عێراقدا ئاماژه ی بۆ كراوه ، به تایبه تی له ڕۆژنامه ی «كوردستانی نوێ »دا ...

ئه و ده ست نووس و نووسینانه ش كه له لایه ن بنه ماڵه مابوونه وه ، هۆكارو یاریده ده ری گرنگ بوون و بۆ ئه وه ی زیاتر بنج و بنه وانی ئه و كاره ساته ئاشكرابێت ، جگه له شاهیدی ئه و كه سانه ی كه له نزیكه وه ئاگاداری ورده كاری یه كانی ئه و كاره ساته بوون .

ئه م كتێبه چه ندین بابه تی نوێ ی تێدایه، جگه له و نووسینانه ی كه له ڕۆژنامه ی كوردستانی نوێ بڵاو بۆته وه و چه ند نووسه رێك بیروڕای خۆیان سه باره ت به كاره ساتی قه تلوعامی بنه ماڵه ی مێرگه سووری نووسیووه كه ڕه نگه لایه نه تاریكه كانی ئه م كاره ساته ڕووناك بكه نه وه و حه قیقه ته كه ی بۆنه وه كانی دواتر

به شێوه یه کی ڕاست و دوور له سۆزو عاتیفه تۆمار بکاو به ڕێ رچی ئه و پاساوه ش بده نه وه، که هه ندێ که س ده یانه وێ له و ڕێگایه وه مێژووی ئه و کاره ساته به چه واشه یی بگه یه ننه خه لك.

له کۆکردنه وه و ئاماده کردنی ئه م کتێبه دا، هه وڵم داوه، وه ك ڕۆژنامه نووسێك که به دوای حه قیقه ته کاندا وێڵه، ئه ڵقه ونه کانی کاره ساته که و مێژووی ژیان و تێکۆشانی فاخیر مێرگه سۆری بدۆزمه وه و پشت به دیکیۆمێنت و سه رچاوه جیاجیاکان ببه ستم و نه که ومه ژێر کاریگه ری تی سۆزو عاتیفه ی بنه ماڵه و گه وره یی تاوانه که و ئه وه ی که فاخیر باوکی منه، هه وڵیشم داوه لایه نه ئیجابی وسه لبیه کانی ڕۆڵی فاخیر بخه مه به رچاوی خوێنه ران و ئه و کسانه ی له زاری ئه و که سانه ی که چاوپێکه تنم له گه ڵدا کردوون یان ئه و که سانه ی که له فاخیره وه نزیك بوون، وه کو خۆی و به ئه مانه ته وه بنووسمه وه و بیخه مه سه ر لاپه ره کانی ئه م کتێبه.

سه باره ت به ئازایه تی و له خۆبردوویی و وره وشته کانی تری فاخیر وه کو چۆن بۆیان باس کردووم هه رواش تۆمارم کردوون، چونکه ئه و کاته ی گیراو شوێن بزر کرا من ته مه نم له چه ند ڕۆژێك تێ په ری نه کردبوو، هیوادارم توانیبێتم وه ك ڕۆژنامه نووسێك، په رده له سه ر چه ند ڕازو نهێنیه کی ئه و سه رده مه لابده م و کونجێکی تاریکی مێژووی گه له که مان ڕووناك بکه مه وه.

به ئومێدم ئه و که سانه ی که له نزیکه وه ئاگاداری ئه ڵقه کانی کاره ساته که ن، به شێوه یه کی ڕاسته وخۆ یان ناراسته وخۆ، زانیاریه کانیان له توره گه ی ڕازه کانیاندا ده ر بێنن و بیخه نه سه ر ئه و نووسینانه ی که له دووتوێ ی ئه م کتێبه و کتێبه که ی «فصول مأساوية لجريمة منسية»ی هاوار صادق دا نووسراون بۆ ئه وه ی هیچ لایه کی ئه و کاره ساته به شاراوه یی نه مێنێته وه.

ئه وه ی شیاوی باسه زۆربه ی ئه و نووسینانه وه کو خۆی نووسراونه ته وه، ته نها ئه و برگانه لابراون که زیاتر بۆ زمانی ڕۆژنامه به کارهاتوون.

شێروان فاخیر مێرگه سۆری

سلێمانی ١٩٩٧

شێروانیه کان خێڵێکی گه وره و ناوداری کوردن، له ولایه تی (وان) و ناوچه ی شێروان مه زن نیشته جێن، ئێستاش به سه ر ژماره یه کی زۆر له گونده کانی ناوچه ی شێروان و مێرگه سوردا بڵاوبونه ته وه و هه ندێکیشیان له گونده کانی هه ولێر نیشته جێن.
سه باره ت به ره چه له کی شێروانییه کان بیروڕای جیا جیا هه یه، هه ندێك پێیان وایه که ره چه له که یان ده گه ڕێته وه بۆ ناوچه ی هه کاری له کوردستانی تورکیا. هه ندێکیش ده ڵێن پیاوێك له ولایه تی (وان)ه وه که ناوی (شێر)بووه، شوێنی خۆی به جێ دێڵێ و دێته ئه و شوێنه ی که ئێستا پێ ی ده ڵێن: (شێروان)، که چی رایه کی تر هه یه ده ڵێن شێروانی یه کان ده گه ڕێنه وه سه ر کابرایه ك به ناوی مه لا ئه حمه د که له ولایه تی (وان) دێته ناوچه ی شێروان.
مه لا ئه حمه د ده کوڕی هه بووه، پاش ئه وه ی له شێروان نیشته جێ بووه، ڕۆژ به ڕۆژ ده سه ڵاتی زیادکردووه، هه ر له به ر ئه وه گه وره پیاوه کانی خێڵی شێروان، له به ری ناوچه ی شێروان مه زندا ترسی زیادبوونی ئه و ده سه ڵاته یان لادروست ببوو، بۆیه هه وڵی له ناوبردنی مه لا ئه حمه دو کوره کانیان داو نه خشه یان بۆ کێشا.
له نان خواردنێکی تایبه ت دا، به ئاماده بوونی زۆربه ی پیاوه ناوداره کانی شێ روانیه کان له گوندی بنیشو له نێوان ( شێــــروان - لێری)، مه لا ئه حمه دو هه موو کوره کانیان کوشتن.
ئه وه ی له و قه تلوعامه به ساغی ده رچوو شازه مانی ژنی مه لا طه ی کوری مه لا ئه حمه دو کوڕیه که ی (حسن) که ته مه نی (٢٠) ڕۆژ بوو.
شازه مان ئه و ناوچه یه ی به جێ هێشت و چووه (ئامێدی)، حسن کوری شازه مان ـ ی بوکی مه لا ئه حمه د، له سێبه ری پادشای ئامێدی گه وره بوو، وه ك کوری خۆی ته ماشای ده کرد، ئه ویش ڕۆژ به ڕۆژ سیفات و ره وشتی پاشایه تی و ئه میرایه تی فێرده بوو.
(حسن به گ) پاش ئه وه ی هه ستی به وه کرد که ده توانێ بگه ڕێته وه و سه رۆکایه تی خێڵه که ی بگرێته ده ست، بێ دوو دڵی خۆی و هێزێکی زۆر گه رایه وه ناوچه که ی، (حسن به گ) له جیاتی ئه وه ی تۆڵه ی باوك و باپیرو مامه کانی بکاته وه، سیاسه تێکی زۆر نه رم و نیانی به کارهێناو توانی به و سیاسه ته خه ڵکی ناوچه که بۆ لای خۆی رابکێشێ و له ماوه یه کی کورتدا سه رۆکایه تی عه شیره تی بۆ

خۆی مسۆگەر کرد.
دوای ئەوەی حسن بەگ کۆچی دوایی کرد، دیارنی یە کە کێ سەرۆکایەتی عەشیرەتی کەوتە دەست، بەلام جارێکی دیکەش عەشیرەتی شێروانی لەسەردەمی ئاغدەل ئاغا ناوبانگی دەرکردەوە، سنووری دەسەلاتەکەی گەیشتە ناوچەکانی زێباری و دۆلەمەرێ و مزووری و برادۆست و شێخان وهەسنان.
لەدوای هێرشی هۆلاکۆ بۆ کوردستانی عێراق، عەشیرەتی شێروانی پەرت و بلاوبوون و چەندین خێزانیان بۆ هەولێرو کەندیناوە کۆچیان کردو تاکو ئێستاش هەر لەهەولێر نیشتەجێن.
لەناو شێروانیەکان دا پیاوی زۆر بەتواناو ماقوڵ هەڵکەوتووە، لەوانە حسن بەگی کەکلەیی یە، براکانی حسن، یەکێکیان ناوی صوفی بوو لەگوندی رێزان دادەنیشت، ئەوەکەی وەلی بەگ خۆی بەمریدی شێخ ئەحمەدی بارزانی دەزانی و هەمیشە بەربەرەکانی ماڵی حەمەد ئاغای مێرگەسۆری دەکرد.
لە ساڵی ١٩٤٥ کەویستی دەست بەسەر مەرکەزی پۆلیسی مێرگەسووردا بگرێ کوژراو دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێ هێشت سەعیدو ئەحمەد، دواتریان بەدەستی زێباری یەکان دەکوژرێ.
عەلی ئاغای برایەکی تری حسن بەگە لەگوندیَ (خێرزۆك) دادەنیشت، ئەوەیەکی لەگەڵ مەلا مستەفا چووەتە سۆڤیەت.
مەرعان بەگ ـ یش لەگوندی (کەکلە) دادەنیشت. برا گەورەی مەرعان بەگ ناوی حسن بەگ بوو، کەلەسەرەتادا سەری بۆ حوکمی پاشای کۆرە دانەنواند، بەلام دواتر لەبەرامبەرهێرشێکی گەورەی پاشای گەورەدا، حسن بەگ بەدیل دەگیرێ، دەیبەنە رواندز پاشای گەورە عەفوی دەکاو ناوچەکەی دەبێتە بەشێك لەقەلەمرەوی میرنشینی سۆران.
لەهێرشەکەی عوسمانیەکان دا بۆ سەر میرنشینی سۆران، شەرێکی دەستەویەخە لەگەڵ لەشکری تورك دەکا، بەلام دوای گرتنی پاشای گەورەو رەوانەکردنی بۆ ئەستەمبوڵ، حسن بەگ و کورەکانیشی دەگرن و رەوانەی زیندانی کەرکوك دەکرێن، دواتر حسن بەگ ئازاد دەکرێ و دەگەرێتەوە ناوچەی مێرگەسۆرو کورەکانی دابەش دەکا بەسەر ئەم شوێنانە :

حه مه د ئاغا بۆ (مێرگه سور)، میر مه لا بۆ (سه روکانی)، سلطان بۆ (بێریساو)، حسین بۆ گوندی (که لۆك)، صادق بۆ گوندی (مه مۆلان).
یه کێك له پیاوه به تواناو ناسراوه کانی خێڵی شێروانی ئه حمه د ئاغای کوری سلطان ئاغا بوو، که به ئه حمه د ئاغا بێریسیاوی ناسراوبوو، خزمایه تی شێروانیه کان له گه ڵ بنه ماڵه ی بارزانی له سه رده می ئه حمه د ئاغا بێرسیاوی ده ستی پێ کردووه، خوشکی خۆی که ناوی (خاتوون) داوه ته شێخ مه حمه دی باوکی مه لا مسته فای بارزانی.
دواتر کچێکی خۆشی (محبوبه) داوه ته مه لا مسته فای بارزانی.
ئیعدام کردنی عبدالسلام رێگای بۆ شێخ ئه حمه د خۆشی کرد بێته شێخی بارزان.
که شێخ محه مه د مرد، ئه حمه د ئاغا مه لا مسته فای هێنایه لای خۆی و به خێوی کرد، ئینجا وه کو گوتمان کچێکی خۆشی که ناوی (محبوبه) بوو دایه مه لا مسته فا.
ئیعدام کردنی عبدالسلام رێگای بۆ شێخ ئه حمه د خۆش کرد بێته شێخی بارزان، ئه حمه د ئاغای بێرسیاوی زۆر پشتی شێخ ئه حمه دی بارزانی گرتووه، خۆی و عه شیره ته که ی به رگریان له شێخ ئه حمه د ده کرد.
تاتوانی شوێنی خۆی قایم بکاو که س نه توانێ رکێبه ری له گه ڵدا بکا، خزمایه تی بنه ماڵه ی حه مه د ئاغای مێرگه سوری به م شێوه یه حه مه د ئاغای کوری حسن به گ مامی ئه حمه د ئاغای بێرسیاوی بوو ئه مه ش له مێرگه سورو ده وروبه ری دامه زران زۆریش ئازا بووه و له گه ڵ باوکی (١٤) ساڵ له زیندانی که رکوك بوو، چونکه به ربه ره کانی ده وڵه تی تورکیای ده کرد ئه مه ش له دوای مردنی سێ کوری لێ به جێ ما، «صالح، سلێمان به گ، سه عید».
(صالح)یش چوار کوری لێ به جێ ما «سلطان، حمد ئاغا/باوکی فاخر، مصطفی، عبدالله)

## دره‌ختی بنه‌ماڵه‌ی حه‌مه‌د ئاغای مێرگه‌سوری:

مه‌حه‌مه‌د ئاغا مێرگه‌سوری کوڕی صالح کوڕی حمد ئاغا کوڕی حسن به‌گ که‌کله‌ی کوڕی میر مه‌لا کوڕی صوفی ئاغا کوڕی مه‌رعان ئاغا کوڕی سلطان کوڕی عه‌لی کوڕی عه‌زیز کوڕی حه‌مه‌د کوڕی ئه‌حمه‌د کوڕی سلێمان کوڕی یحیی کوڕی صالح کوڕی سه‌عید کوڕی فتاح کوڕی حسین کوڕی رشید کوڕی میر عمر کوڕی میر ئه‌حمه‌د کوڕی قادر کوڕی جوشر کوڕی محی الدین کوڕی شێخ عمر کوڕی شان ئاڤده‌ڵ کوڕی لاجین کوڕی ئاڤده‌ڵ کوڕی فه‌رزی کوڕی شێرۆ کوڕی عبدالله کوڕی شێخ حسین کوڕی ابراهیم کوڕی سوار کوڕی لاجین کوڕی ئۆمه‌ر کوڕی حسین کوڕی حسن کوڕی طه کوڕی میران کوڕی حسن به‌گ کوڕی مه‌لا طه کوڕی مه‌لا ئه‌حمه‌د.

# حه مه د ئاغای مێرگه سۆری و رۆڵی له بزاڤی رزگاریخوازی گه لی کورددا

حه مه د ئاغای مێرگه سۆری، سه رۆکی خێڵی شێروانی بوو، له ساڵی ۱۹۰۰ له دایك بووه، به مێرگه سۆری ناسراوبوو، چونکه له مێرگه سۆر ناوه ندی قه زای زێبار داده نیشت.

چوارجار ژنی هێناوه و سێ کچ و (۱۰) کوری هه بوو، (حسین)ی کوری له ساڵی ۱۹٦۲ له شه ری به رگری له بارزان دا کوژرا، (۷) کوری له نێوان (۱۹۷۱ـ۱۹۷٥) له لایه ن بنه ماڵه ی بارزانی قه تلوعام کران و کورێکیشی که ناوی (نزار) بوو له ساڵی ۱۹۷٦له به غدا به ده سیسه ی کوره کانی بارزانی کوژرا.

حه مه دئاغا خزمایه تی له گه ڵ شێخانی بارزانی هه بوو، له خۆشی و ناخۆشی شێخه کانی بارزان به شداری کردووه، له هه موو شه ری بارزانی یه کان دا دژ به عه شیره ت و حکومه ته کانی عێراق به شداری کردووه.

له ساڵی ۱۹۳۰ ، له شه ری نێوان بارزانیه کان و برادۆسته کاندا سه رپه رشتی به ره ی خواکورکی ده کردو له گوندی ئه لوش برینداربوو. له بزوتنه وه ی بارزانی یه که مدا ساڵی (۱۹۳۲) پێشه نگی ئه و هێزانه بوو که به رگری له خاکی بارزان دا ده کرد.

له ساڵی ۱۹٤۱دا حکومه تی پاشایه تی حوکمی سێ ساڵ زیندانی به سه ردا و ساڵ و نیوێك له زیندان مایه وه، دوای ئازادکردنی جارێکی دیکه گه رایه وه ناوچه ی خۆی و له بزوتنه وه ی بارزانی دووه میشدا له نێوان (۱۹٤۳ـ ۱۹٤٥) به خۆی و هێزێك پێشی له هێزه کانی حکومه ت گرت و پردی خه لانی ته قانده وه، بۆ ئه وه ی رێگا له پێشره وی هێزه کانی حکومه ت بگرێ.

له کاتی دامه زراندنی کۆماری مه هابادیش له ساڵی ۱۹٤٦دا، پله ی کۆلۆنێلی پێ دراو لێپرسراوی به ره ی سه قز بوو.

دوای روخانی کۆماری مه هاباد، حه مه د ئاغا له گه ڵ شێخ ئه حمه دی بارزان گه رایه وه کوردستانی عێراق، ماوه یه کی کورت له

(دیانا) مانه وه. دواتر هه ردووکیان له لایه ن حکومه تی پاشایه تی گیران و حوکمی سێداره یان به سه ردا سه پاندن، وه هاب ئاغای کوڕی حمه د عه لی ئاغاي ره واندزی یشیان له گه لدا بوو، دواتر حوکمه که کرا به (۲۰) ساڵ، به لام پاش به سه ر بردنی شه ش ساڵ له زیندان ئازاد کراو گه ڕایه وه ناوچه ی بارزان، له غیابی شێخ ئه حمه دی بارزان دا، حه مه د ئاغا بووه که سی یه که می ناوچه که و بارزانیه کان.له ساڵی ۱۹۵۵ جارێکی دیکه ده گیرێته وه و ده خرێته زیندانی ناصریه. له گه ڵ ده ست پێ کردنی یه که م ته قه ی شۆڕشی ئه یلول له ساڵی ۱۹٦۱دا حه مه د ئاغا بووه پێشمه رگه ی شۆڕش و تاگه یشته پله ی ئامر هێزی سه فین...

هه ر له ڕیزه کانی شۆڕش مایه وه تا له ساڵی ۱۹۷۲ ده ست به سه ر کراو له ساڵی ۱۹۷۵ به بڕیاری مه لا مسته فا کوژرا.

حه مه د ئاغای مێرگه سۆری که سایه تیه کی کۆمه لایه تی ناسراو و به هێزی ناوچه که ی خۆی بوو، قسه ی لای هه موو که سێك ده ڕۆیشت.

دیوه خانه که ی هه میشه پڕ بوو، زۆر میهمان نه واز بوو، سه خی ته بیعه ت بوو، له هه مان کاتدا زۆر ئازا و به جه رگ بوو، خاوه ن قسه و بڕیاری خۆی بوو.

پابه ندبوونی به سیما خێله کیه کان ڕێگای له وه نه نه گرتبوو وه ك نیشتمان په روه رو تێکۆشه ری گۆڕه پانی کوردایه تی، له هه موو کات و ساتێکدا ئه سپی خۆی تاوبدات.

له هێڵی چه پی کوردایه تی دا زۆر نزیك بوو، دۆستی حزبی شیوعی عێراقی بوو، براده رایه تی و دۆستایه تی له گه ڵ زۆربه ي سه رکرده و پیاوماقول و که سایه تیه ناسراوه کانی کورده واری دا هه بوو.

هه تا له ژیاندا بوو، سه رۆکی بێ هاوتای عه شیره تی شێروانی بوو، له لایه ن بارزانی یه کانیشه وه شوێنێکی تایبه تی و ڕێزێکی زۆری هه بوو. هه میشه حه زی له ئاشتی بوو، له زۆر کێشه ی کۆمه لایه تی و عه شایری وه ك ریش سپی و قسه ڕۆیشتوو ده وری میانگیری و کۆتری ئاشتی ده بینی.

## پێش شۆڕشی تەمموزی ۱۹٥۸ :ـ

فاخر کوڕی حەمەد ئاغای مێرگە سۆری یە لە ساڵی ۱۹۳۷ دا لە مێرگە سور لە دایك بووە، لەو کاتەدا ناوچەی بارزان و شێروان لە گرژی و ڕووبەڕووبوونەوەدا بوو لەگەڵ حکومەتی بەغدادا، بزووتنەوەکانی بارزان، ناوچەکەیان خستبووە ژێر بارێکی نائاسایی، لە بزووتنەوەی بارزانی دووەمدا حکومەتی بەغدا هەموو ئیدارەکانی خۆی لە ناوچەکەدا کشاندەوە، منداڵەکانی ئەو ناوچەیە لە خوێندن و قوتابخانە بێ بەش بوون، بۆیە ئاسان نەبوو منداڵەکانی ئەو ناوچەیە فێری خوێندن و نووسین بن.

لە ساڵی ۱۹٤٥ دا فاخر لەگەڵ باوکی چووە ئێران و تا ڕوخانی کۆماری مەهاباد هەر لەوێ مایەوە. دواتر لەگەڵ بارزانی یەکان گەڕایەوە کوردستان، کە پیاوەکانیان دوور خستنەوە، ژن و منداڵەکانیان بەسەر گوندەکانی دەشتی هەولێرو خوارووی عیراق دابەش کرد. ماڵی حەمەد ئاغا بەبەر قەزای مەخمور کەوت، بۆ ماوەیەك لەوێ مانەوە و ژیانێکی زۆر سەخت و ناخۆشیان بەسەر برد، دواتر بە بڕیارێکی حکومەت گەڕانەوە ناوچەکەی خۆیان. هەردوای گەڕانەوەی خولیای خوێندن و نووسین لە مێشکی دابوو، لە نەبوونی قوتابخانەدا سوودی لەو فەرمانبەرانە وەرگرت کە لەوێ بوون بەتایبەتی لە ساڵانی (۱۹٤۹ ـ ۱۹٥۰) زۆر سوودی لە کاك محمد سعید ابراهیم ـ کە خەڵکی سلیمانی یە وەرگرت، بۆ فێربوونی خوێندن و نووسین. زۆر زووش فێری خوێندنەوەو نووسین بوو، هەر کتێبێك و نامیلکەیەکی کەوتبایە بەردەست دەیخوێندەوە و بەڵام لە ئەنجامی ئەو خوێندنەوانەدا خۆی لەناو کتێبە سیاسی یەکاندا دۆزی یەوە.

پاش ڕوخانی کۆماری مەهاباد، باوکی فاخر کە کۆلۆنێلی سەربازی بوو لەو کۆمارەدا، لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان دا گەڕایەوە عیراق ماوەیەك لە دەشتی دیانا دەست بەسەر بووە، کە بارزانی یەکان و شێروانیەکان دوورخرانەوە بۆ خوارووی عێراق فاخر ئەو کاتە تەمەنی دە ساڵان بوو ئەم دوورخستنەوەیە زۆر کاری لە فاخر کرد، یەکەم نیشانەی تێکەڵاوبوونی فاخر لەگەڵ دونیای سیاسەتدا پاش

دوورخستنه وه ی بارزانی یه کان به دیارکه وت، هه روه ها بیرۆکه ی (مارکسیزم-لینینزم) له ناو کورده واریدا به ره به ره ده هاته ئه وه ی که بلاوببێته وه و خه لك ئاشنایه تی له ته کدا په یدابکا. به لام بۆ ناوچه ی بارزان و مێرگه سۆر کارێکی ئاسان نه بوو، چونکه ئه و بیرۆکه یه له نێوه نده عه شایریه کاندا تاکو ئێستاش به کارێکی ترسناك و پڕ مه ترسی و بگره به کفریش داده نرێ، بوون به شیوعی له ناوچه یه کی وه ك بارزان دا که ئه وساکه دوور بوو له هه موو جۆره شارستانیه ت و پێشکه وتنێکدا بۆ گه نجێکی وه ك فاخر، موغامه ره یه کی گه وره بوو.

دوورخستنه وه ی بارزانی یه کان بۆ خوارووی عیراق به تایبه تی بۆ لیوای ناصریه، که مه لبه ندی گرنگ وگه رمی حزبی شیوعی بوو، زه مینه یه کی تازه ی بۆ ژماره یه ك له بارزانی یه روونا کبیره کان دروست کرد که ببن به شیوعی و له گه لْ دونیای شیوعیه تدا تێکه لاوبن. ره نگه مانه وه ی بارزانی له سۆڤیه ت، وای له خه لکێکی زۆر، به تایبه تی له ژماره یه ك له وبارزانیانه کردبێ که ببن به شیوعی و یان هیچ نه بێ شیوعی یان خۆش بوێ، چونکه له و باوه ره دابوون، که بارزانی ده بێته شیوعی و پێویسته خه لکی بۆ دروست بکرێ، بۆ ئه وه ی دوای گه رانه وه ی سوودیان لێ وه ربگرێ.

شێخ صادق بابۆ (برازای مه لا مسته فا) یه کێك بوو له و که سانه که زوو بووه شیوعی، له ناصریه نامه ی بۆ فاخر ده نووسی و باسی حزبی شیوعی بۆ ده کرد، ئه وه سه ره تای دروست بوونی بیرۆکه ی شیوعیه ت بوو له لای فاخر. وه ك مه سه له یه کی زاتیش زۆر خۆی ماندوو ده کردوو تا توانی له فیکری مارکسیزم-لینینزم زیاتر نزیك ببێته وه.

بۆیه ده کرێ شێخ صادق بابۆ به رێکخه ری یه که می فاخر مێرگه سۆری دابنرێ. رۆژ به رۆژ فاخر ئاسۆی روناکبیری و سیاسی فراوانتر ده بوو، له کونج و که له به ری خه باتی چینایه تی تێ ده گه یشت و لێ ی قوولتر ده بووه وه. تا وای لێ هات له کۆرو کۆبوونه وه کانیدا، له گه لْ براده ره کانی و گه نجه کانی ناوچه که دا، باسی رێبازی حزبی شیوعی ده کرد، به ره به ره خه لکی په یدا ده کرد. ته نانه ت ژماره یه ك ژنی بارزانیش ببوونه شیوعی، له وانه خێزانی سلطانی برای حه مه د ئاغای مێرگه سۆری که ئامۆژنی خۆی بوو فاخر

له و ناوچه یه دا چه ندین ئه لقه ی حزبی دروست کرد. ئه و خۆی ته نها نه بوو، لقمانـی کوڕی مه لا مسته فاو کوڕه کانی تری حه مه د ئاغاش هه مووی له گه ڵیدا بوون.

لـه سـالانـی (١٩٥٦ـ١٩٥٧) بـه شێـوه یـه کـی فـراوانـتر ده ستـی به ڕێکخستنی خه ڵك کردو بانگه شه ی ده کردن بۆ ناو ریزه کانی حزبی شیـوعـی، هـه ر لـه و سالانـه دا بـوو کـه لـه ڕێگـای شێـخ صـادقـه وه په یوه ندی به جه مال حه یده ری یه وه په یداکرد.

حـه یده ری یـه کێـك بـوو لـه سـه رکـرده کـانـی حـزبـی شیـوعـی، کـه ـسایه تی یه کی به هێزو به توانا بوو، ره نگه نامه گۆڕینه وه کانی له گه ڵ فاخرو دواتر یه کتر بینینیان کارێکی زۆری له سه ر شه خصیه تی فاخر کرد بێ.

به م جۆره فاخر بوو به لێپرسراوی حزبی شیوعی ناوچه ی بارزان و مێرگه سۆرو راسته وخۆش په یوه ندی به حه یده ری یه وه هه بوو، که هێشتا ته مه نی بیست ساڵ بوو.

هـه ر لـه و کـاتـه وه مـه سئـولیـه تێکـی گـه وره ی کـه وتـه سـه رشـان و مه سئـولیـه تـی نـاوچه یه کـی دواکه وتووی پڕ مـه تـرسی بـه لام تـوانـی بـه لێهاتـویی خـۆی کـاره کـانـی جێ بـه جێ بکـات و وه ك لێپرسراوێکـی به توانا بێته مه یدانی کاری سیاسی و خه ڵکێکی زۆریش بۆ خۆی په یدا بکا.

## گه ڕانه وه ی بارزانی و سه ره تای ململانێ و ناکۆکی :ـ

دوای شۆڕشی ته مموزی ١٩٥٨، مه لا مسته فا له گه ڵ بارزانی یه کان دا گه ڕایه وه عێراق، گه ڕانه وه ی بارزانی بۆ به غدا به دیهاتنی خه ونێکی گه وره ی ئه و بـارزانـی یـانـه بـوو، کـه ببـوون بـه شیـوعـی و هیـواشیـان به بارزانی بوو که له گه ڵ گه ڕانه وه یدا وه کو شیوعیه ك ره فتار ده کاو ده توانی ده وری سه رکرده یه کی شیوعی ببینێ له ناو کورده واریدا.

بۆ فاخر مێرگه سۆریش ده رفه تێکی باش بوو، بۆ ئه وه ی له ته ك سـه رکـرده یـه کـی نـاوچـه ی خـۆیـانـدا بـره و بـه و کـاره بـدات بـه لام ئـه و بۆچوونه راست ده رنه چوو ئه و خه ونه نه هاته دی و تووشی هیوابڕی بوون چونکه مه لا مسته فا، نه ك هه ر نه ببووه شیوعی ، به ڵکو رقی

دونیای لە شیوعیەت هەڵگرتبوو، وەچاوی بەرایی نەدەهات هەر بشیانبینێ هەر کەزانی هەندێ لەخزمەکانی (شێخ صادق و لقمانـی کوڕی و فاخری خزمی) بوونەتە شیوعی، هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی خستە گەڕ،تا بیان گەڕێنێتەوە ژێر سێبەری بنەماڵەو خودانی بارزانی یەوە.

ئەمە دەسپێکی جیاوازی نێوان مەلا مستەفاو فاخر بوو، بەڵام بەرەنگێکی تر، لەروانگەی سیاسی و حزبایەتیەوە، فاخر قاڵ بووەوەی جیهانی شیوعیەت مەلا مستەفای پابەند بەپرنسیپ و بنەما و کۆت و رەوشتی عەشایری. حزبی شیوعی هەوڵی دا شێخ صادق و لوقمان هەروەکو شیوعی بمێننەوە، تەنانەت بەدەر لەعورفی حزبی شیوعی و دیسپلین و پرنسیپەکانی حزب داوایان لەشێخ صادق کرد ببێتە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی*. بەڵام واپێدەچێ شێخ صادق هەر پێ ی خۆش بوو بێت، لەدوورەوە لەگەڵ حزب بمێنێتەوە، دۆستیان بێت، چونکە مەلا مستەفا بەهەرشێوازێك بێت توانی وا لەشێخ صادق بکات لەحزبی شیوعی دووربکەوێتەوە.

بەهەمان شێوەش توانی وا بکات عبیداللەو لقمانیش دووربخاتەوە بەم شێوەیە مەلا مستەفا توانی لەو ململانێ یە لەگەڵ حزبی شیوعی دا، سەرکەوتن بەدەست بێنێ، بەڵام ئەو شێوازەی لەگەڵ فاخردا سەری نەگرت.

فاخر مێرگەسۆری لەدوای (١٤)ی تەمموز، چەند جارێك سەردانی بەغدای کردووە، زیاتر ئاشنایی لەگەڵ کادیرە پێشکەوتووەکان پەیداکردووە، زوو زوو سەردانی بارەگای رۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی کردووە، لەکافتریای رۆژنامەدا لەگفتوگۆ و قسەوباسی سیاسی بەشداری کردووە، زیاتر لەجەمال حەیدەری نزیك بووەوە، حەیدەری کەیفی بەمەلا مستەفا نەدەهات، ناکۆکی و جیاوازی فیکری نێوان ئەو و بارزانی رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبوو، تەنانەت کە حەیدەری بەغدای بەجێ دەهێشت، راسپاردەی کادیرو دۆستەکانی دەکرد کە ئاگایان لەفاخر بێت، زۆر جار لەمەسەلە عەشایری یەکاندا رای فاخریان وەردەگرت، جارێکیان لەگۆشەی (صوت الشعب الكردي) لەرۆژنامەی (اتحاد الشعب)دا بابەتێکی لەسەر کێشەیەکی

* لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ د. عزالدین مصطفی رسول ـ هەولێر ١٩٩٦

ﻫ شایری بڵاوکردەوە بە ناوی (شێرۆوە دین).

فاخر زۆر لە ژێر کاریگەرێتی جمال حەیدەری بوو، رەنگە ئەوەش وای کردبێ کە پانتایی ناکۆکی یەکانی ئەو و بارزانی زیاتر بێت، لە هەمان کاتدا مانەوەی لەناو ئەو هەموو کادیرە پێشکەوتوانەدا، زیاتر لە حزبایەتی قاڵ کردەوە.

ئەو کاتەی کە فاخر لە بەغدا بوو(١٩٥٩)، مەلا مستەفا چەند جار فاخری دیوە، زۆر هەوڵی لەگەڵ داوە واز لە شیوعیەت بێنێ، تەنانەت چەندین رۆژ لە ماڵی خۆی داینـاوەو دەست بەسەر بووە، (ئەو کاتە مەلا مستەفا لە ماڵەکەی صباحی نوری سعید دا بوو)، بەڵام نەخزمایەتی و نە توندو تیژی، کاری تێ نەکردووە، سەرەنجام بارزانی پێ ی گوتووە:ـ ئەگەر واز لە شیوعیەت دێنێ خزمایەتیمان نوێ دەکەینەوە، پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆری شێخ صادق، بارزانی وازی لە فاخر هێناو ئازادی کرد.. دیارە سووربوونی فاخر لەسەر رێبازەکەی، ناکۆکی نێوان خۆی و بارزانی زیاتر کرد، ئەگەر چی فاخر ئەو کاتە گەنج بوو، بەڵام بارزانی لە هەموو کۆڕو مەجلسێکدا بە خراپی باسی فاخری دەکرد و خۆشی نەدەویست.

## شەڕی لۆلان و تاوانبارکردنی فاخر لەلایەن بارزانی یەوە

لە ساڵی ١٩٥٩دا، شێخ رەشیدی لۆلان لە ناوچەی برادۆست لە دژی عبدالكريم قاسم یاخی بوو، بۆ سەرکوتکردنی یاخی بونە چەکداری یەکە، هێزێکی بارزانی یەکان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا و هێزێکی حزبی شیوعی کە نزیکەی

(١٥٠) چەکدار دەبوو بە سەرکردایەتی فاخر مێرگەسۆری و سەرپەرشتی راستەوخۆی جەمال حەیدەری تەرخان کرا.

بۆ مەلا مستەفا دەرفەتێکی زێڕین بوو، تا بتوانێ لە رێگای ئەو شەرە چەك وتفاق بۆ بارزانی یەکان پەیدا بکاو تۆڵەی خۆی و عەشیرەتەکەشی لە شێخ رەشیدو برادۆستەکان بکاتەوە، کە دوژمنایەتیەکی دێرینیان لە نێوانیاندا هەبوو، هەروەها دڵسۆزی خۆشی بۆ زەعیم عبدالكريم قاسم دووپات بکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا دوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەت وەك سەرکردەیەکی بە هێز خۆی نیشان بداتەوە.

بۆ حزبی شیوعیش دەرفەتێکی باش بوو، بۆ بە هێزکردنی

ﻫ ئەم بابەتەی لە مانگی حوزەیران یان تەمموزی ١٩٥٩ بڵاوکردۆتەوە

رێکخراوه جه ماوه ری و مقاوه مه ی شه عبی و نواندنی وه فاداری و دلسۆزی بۆ شۆڕشی ته مووزو سه رکرده که ی.

مه لا مسته فا ده یویست هه موو هێزه که له ژێر سه رکردایه تی ئه ودا بێت، که چی حزبی شیوعی به تایبه تی جه مال حه یده ری و فاخر مێرگه سۆری قایل نه بوون، که هێزه که ی خۆیان بخه نه ژێر فه رمانی بارزانی یه وه.

جه مال حه یده ری و مه لا مسته فا که یفیان به یه ك نه ده هات، تا له سێداره دانی حه یده ریش مه لا مسته فا هه میشه قسه و جنێوی پێ ده دا . پێ ناچێ ناکۆکی ئه و دوو که سه شه خصی بووبێت، به ڵکو ناکۆکیه کان ره نگێکی سیاسیان هه بوو، له هه مان کاتیشدا بارزانی و فاخر یه ك نه بوون، دوای ئه وه ی فاخر گوێ ی له قسه کانی بارزانی نه گرت و به پێچه وانه ی خزم و که س و کاره کانی تری، وازی له حزبی شیوعی نه هێنا، ناکۆکیه کان قووڵتر ببوون، سه ره ڕای ئه و هه موو ناته باییه له نێوان سه رکرده کانی ئه و دوو هێزه، له شه ڕی لۆلان دا، شێخ ره شیدو هێزه که ی تێك شکێنران.

ده زگاکانی راگه یاندنی حزبی شیوعی و گرنگی و بایه خێکی زۆریان به شه ڕه که و به سه رکه وتنه که دا، رۆڵی هێزه که ی حزبی شیوعی له نووسین و ریپۆرتاژه کانی (طریق الشعب)دا، زۆر به دوورو درێژی نووسراون و ره نگی داوه ته وه، به پێچه وانه وه رۆڵی بارزانی و هێزه که ی بایه خی وای پێ نه دراوه... له هه مان کاتدا ناکۆکیه کان له نووسینه کان دا ره نگیان دابووه وه به ئاسانی به دی ده کرێن.

له یه کێ له نووسینه کاندا به م جۆره ناوی مه لا مسته فا هاتووه «المقاومة الشعبية بقيادة وسو السبزچي و الملا مصطفى»، که مکردنه وه ی رۆڵی مه لا مسته فاو هێنانی ناوی وسو سه بزه چی که فه رماندەیه‌کی بچووکی هێزه کانی حزبی شیوعی بوو، کارێك بوو به فه رمانی جمال حه یده ری کرابوو، ئه و نووسینه رق و قینی مه لا مسته فای به رامبه ر به حه یده ری، له لایه ك و فاخر له لایه کی دیکه زیاتر کرد. مه لا مسته فا، فاخری به وه تاوانبارکرد که له کاتی شه ڕه که دا ته قه ی لێ کردووه وه گولله یه کی له قاچی داوه، بۆ ئه وه ی بیکوژێ، زۆر جاریش تا کۆتایی شه سته کان بارزانی له زۆربه ی کۆڕو کۆبوونه وه کاندا ئه و قسه یه ی دووپات کردۆته وه و به قه ناعه ته وه

ئه وه ی ده گوته وه، له کاتێك دا که فاخر له به جێ هێنانی ئه رکێکی حزبی دا بوو، به هیچ جۆرێ بیری له کاری وا نه کردبوه وه.

حزبی شیوعی هه ر دوای کۆتایی هاتنی شه ڕه که، زۆر هه وڵی دا ئه و تۆمه ته له سه ر فاخر نه هێڵێ، ئه گه ر چی جه مال حه یده ری په یوه ندی یه کانی له گه ڵ بارزانی زۆر خراپ بوو، به ڵام له به رئه وه ی ئه و کاته به که سی دووه می حزبی شیوعی له قه ڵه م ده دا، نفوزی خۆی زۆر به کارهێنا و ته نانه ت به راشکاویش ئه و قسه ی بارزانی به درۆ ده خسته وه، جارێکیشیان به بارزانی گوتبوو:

«ده ڵێ ی فاخر گولله یه کی له قاچم داوه ده رانکه که ت هه ڵکه با ببینین»*، ئه و قسه ی جه یده ری بارزانی زۆر توره کردبوو، چونکه ئه و قسه یه ئه وه ده گه یه نێ که ئه و تۆمه ته هه ڵبه ستراوه و له راستی یه وه دووره.

دوای کۆتایی هاتنی شه ڕه که و شکاندنی شێخ ره شیدی لۆلان، بارزانی به ره به ره هێزو توانای جارانی گه ڕایه وه و که وته دژایه تی کردنی حزبی شیوعی و قه ده غه کردنی حزبایه تی له ناوچه ی بارزان و مێرگه سۆردا. له هه مان کاتیشدا فاخر دوای شه ڕی لۆلان، ئه ستێره ی کۆمه لایه تی و سیاسی له گه شه کردن دا بوو، پشت و په ناشی حزبی شیوعی بوو له ناوچه که دا، بۆیه بارزانی که وته دژایه تی و ململانێ کردنی، هه وڵیشی دا فاخر له ناو ببات و به به رده وام هه ڕه شه و گوره شه ی بۆ ده نارد، سه ره نجام بۆ ده ربازکردنی له تۆڕی بارزانی،حزبی شیوعی بڕیاری دا فاخر ناوچه که به جێ بهێڵێ، ئه ویش به ناچاری له کۆتایی ساڵی ١٩٥٩ دا ناوچه که ی به جێ هێشت

* رانك : شه پك (شه لواری) بادینی

## ( دوورکه‌وتنه‌وه‌و زیندانی نوگره‌ سه‌لمان )

دوای کۆتایی هاتنی شه‌ڕی ڕه‌شید لۆلان، فاخر ناچار بوو ناوچه‌که‌ به‌ جێ بهێڵێ، سه‌ره‌تا بۆ ماوه‌یه‌کی کورت له‌ ڕواندز مایه‌وه‌، ئینجا چووه‌ هه‌ولێر، ئه‌ندامی لیژنه‌ی محه‌لی بوو، هه‌میشه‌ مه‌ترسی له‌سه‌ر ژیانی هه‌بوو، له‌به‌ر ئه‌وه‌ نه‌یتوانی له‌ هه‌ولێریش بمێنێته‌وه‌، بۆیه‌ له‌سه‌ر بڕیاری حزب چووه‌ موصڵ... دوو ساڵ له‌ موصڵ مایه‌وه‌، ئه‌و ماوه‌یه‌ دوور بوو له‌ ناکۆکی و ملململانێ. له‌وێ به‌ هۆی کاری حزبایه‌تی یه‌وه‌ له‌گه‌ڵ شیوعی یه‌کانی موصڵ و ده‌ڤه‌ری بادینان دا ئاشنایی په‌یدا کرد، هه‌میشه‌ له‌ کادیره‌ سه‌رکرده‌کان و ئه‌ندامه‌ پێشکه‌وتووه‌کان دا نزیك بوو، ئه‌و کاته‌ (أبوحكمت) که‌ ماوه‌یه‌کی زۆر ئه‌ندامی لیژنه‌ی مه‌رکه‌زی حزب بوو له‌ موصڵ، له‌گه‌ڵ ئه‌ودا کاری ده‌کرد.. ماوه‌یه‌ك لێپرسراوێتی ڕێکخستنی جووتیارانی له‌ ده‌ورووبه‌ری موصڵ خرایه‌ ئه‌ستۆ.

دوورکه‌وتنه‌وه‌ی له‌ ماڵی باوکی ناچاری کرد، په‌نا بباته‌ به‌ر کارکردن، (کرێکاریی، بۆیاخچێتی، ئیش و کاری سه‌رپێ ی، دارتاشی... تاد). بۆنموونه‌ جارێکیان فاخر که‌ خه‌ریکی کاسبی پێڵاو بۆیه‌کردن بوو، له‌ چایخانه‌یه‌کی (باب الطوب)دا فاخر پێڵاوی ئه‌بی ئاغای سپینداری بۆیه‌ ده‌کا، که‌ بۆ سه‌ردانی فاخر هاتبوو، به‌ڵام خۆی پێ ی نه‌ناساندبوو.

له‌ ئه‌نجامی تێکه‌ڵاوبوونی له‌گه‌ڵ عه‌ره‌به‌کاندا عه‌ره‌بیه‌که‌ی زۆر باشتر بوبوو، کاتێکی زۆریشی بۆ خوێندنه‌وه‌ ته‌رخان کرد، بۆیه‌ ئه‌و دوو ساڵه‌ی که‌ له‌ موصڵ بوو ئاسۆی ڕوناکبیری فراوانتر بوو، که‌سایه‌تی سیاسی و حزبی به‌هێزتربوو، گیانی به‌رخۆدان و هاوڕێ یه‌تی مکوم و پته‌وتر بوو، له‌ناو هاوڕێکانیدا به‌ (الرفيق كريم) ناسرابوو، ئه‌و ناوه‌ نهێنی یه‌ی تا دوا ڕۆژی ژیانی پێوه‌ی لکابوو زۆر له‌ حزبیه‌کان، هه‌ر به‌ هاوڕێ (کریم) بانگیان ده‌کرد.

ئه‌و ماوه‌یه‌... له‌ ژیانی فاخردا کاتێکی هێمن بوو، به‌ڵام ماوه‌یه‌کی پڕ بایه‌خ بوو، بۆ قاڵ بوونه‌وه‌ له‌ناو حزبایه‌تی، ناسینی خه‌ڵك، زانینی ڕوناکبیری و زانیاری زیاتر له‌سه‌ر بیری(مارکسیزم-لینینزم)، به‌ڵام ئه‌و هێمنی یه‌ کاتی بوو، په‌یوه‌ندی یه‌کانی حزبی شیوعی و

زه عیم قاسم رۆژ به رۆژ به ره و تێکچوون ده چوو، کادیرو ئه ندامانی حزب ترسیان لێ نیشتبوو، به ئازادی نه یان ده توانی کاری حزبایه تی بکه ن.

فاخر ئه و کاته له شاری موصلْ له ئوتێل به غدا له (نزیك پردی کۆن)ه وه له گه لْ کۆمه لێك له هاوڕێکانی دا پێکه وه بوون، (حمید ئامێدی) ئه ندامی حزبی شیوعی، خاوه نی ئوتێله که بوو، دالْده ی ئه و هاوڕێیانه ی دابوو.

پاشان ئوتێل به غدا که وته ژێر چاودێری پۆلیس و پیاوانی حکومه ته وه، ژیانی ئه و کۆمه له شیوعی یه که وته مه ترسی یه وه، بۆیه ئه ندێکیان بلاوه یان لێ کرد.

له گه لْ تێکچوونی په یوه ندی یه کانی قاسم و حزبی شیوعی و ده ست پێ کردنی شالاوی گرتن و راوه دونان. خاوه نی ئوتێل به غداو ژماره یه ك له و شیوعیانه ی که له وێ بوون گیران، فاخر له کاتی گه مارۆدانی ئوتێله که داو ده ستگیرکردنی هاوڕێکانی له ده ره وه بوو، ئه مجاره یان ده ربازبوو، به بڕیاری حزب ماوه یه ك خۆی شارده وه، دواتر حزب بڕیاری دا ژن بێنێ.

ئه و بڕیاره ی حزب بۆ فاخر، مه سه له یه کی چاوه ڕوان نه کراو بوو، دۆزینه وه ی هاوسه رێکیش که له ژیانی فاخر بگات ئاسان نه بوو، بۆیه پێویست بوو له ناو ریزه کانی حزب دا هاوڕێ یه کی کچ هه لبژێرێ، که له گه لْ خواست و بۆچوونه سیاسی یه کانی دا بگونجێ.ئه و ماوه یه ی که له ئوتێل به غدا بوو له گه لْ(حمید ئامێدی)خاوه نی ئوتێله که په یوه ندی زۆر خۆش بوو،خوشکی حمید ئامێدی،(خاتوو مریم) له حیزبی شیوعی دا کاری ده کرد،ئاشنایيان له گه لْ فاخردا هه بوو،دوای گیرانی (حمید)یش،فاخر بۆ سه ردان وهه والْ پرسین زوو زوو ده چووه مالْیان.بۆیه له(خاتوو مریم)ی* گونجاوتر نه دۆزیه وه، به ڕاستیش خاتو مریم،جگه له وه ی وه ك هاوسه رێك پشت و په نای فاخر بوو،له ژیانی حزبایه تی و سیاسیشدا هاوڕێ و گه نجینه ی نهێنیه کانی ومه ئمور به ریدی حزبیشی بوو، ئێستاش زۆر ڕازو نهێنیه کانی فاخری لا یه که ئه لبومی ژیان و تێکۆشانیه تی.

له سالْی ١٩٦٠دا،له کاتی بزوتنه وه که ی (عبدالوهاب الشواف)دا، فاخریش له مانگی مارتی٥٩دا، ماوه یه ك له به ندیخانه ی موصل

* فاخر دوو کوڕ (ئاراس و هه ندرێن) و سێ کچی (ره وشه ن، شه مێران، شه پۆل)ی هه یه.

مایه وه،(إسماعیل عباوی) یه کێك له به ر پرسه کانی ئه و ساکه ی موصل بوو،کاتی خۆی به رێوه به ری ناحیه ی مێرگه سور بوو،هه رکه زانی فاخر مێرگه سوری گیراوه،دۆسیه که ی پڕکرد له زانیاری،بۆلی له مێرگه سۆر،به شیوعی کردنی ناوچه که و دژایه تی کردنی ئاغاو ده ره به گ و......هتد.

ئه وزانیاریانه بوونه مایه ی سه رئێشه یه کی زۆر بۆ فاخر بۆژانه چه ند سه عاتێك به هه موو جۆرێ ئه شکه نجه یان ده دا ،(حسێن)ی کوڕه گه وره ی حه مه د ئاغا که شیوعی بوو وزۆر هاوسۆزی بنه ماڵه ی بارزانی بوو.

چه ند جارێ له زینـدان دیـده نیـی کـرد هـه وڵیـشی دا ئـه و ئه شکه نجه یه ی له سه ر کۆم ببینێته وه جگه له وه ش داوای لێ کرد واز له شیوعیه ت بێنێ،هه روه ها زۆر له خزم و ناسیاوه کانی هه مان پێشنیاریان پێش که ش کردبوو،به ڵام فاخر هه موو ئه و پێشنیارانه ی ره ت کرده وه و وازی نه هێنا.

دواتر فاخر گوێزرایه وه بۆ به ندیخانه ی (كرادة مريم) له به غدا،ئینجا بۆ به ندیخانه ی (نوگره سلمان) له خوارووی عێراق، ماوه یه کی زۆر له نوگره سه لمان بێ هه واڵ بوو،به ڵام دواتر له ڕێگای پۆسته ی حزبیه وه، ئاگاداری کاك حمیدی خه زووری کرده وه. نوگره سه لمان ئه و کات پڕبووه له ئه ندامانی حیزبی شیوعی، دیسان ئه وه ده رفه تێکی تربوو بۆ فاخر، چونکه زیندان له و کاته دا قوتابخانه بوو، ئه وکه سانه که له گه ڵیدا بوون،ده ڵێن:فاخر مرۆڤێکی زۆر مه عشه رو مه شره ب خۆش بوو، دۆست په رست بوو، خزمه تگوزار، له په یوه ندیه کانی جیاوازی نه ده کرد له نێوان ته یارێکی سیاسی و ته یارێکی تردا،له گه ڵ شیوعی،نه ته وه یی و دیموکراتیخوازو پارتیه کان و....هتد په یوه ندی زۆر خۆش بوو، هه رگیز نه یویستوه که سایه تیه حزبیه که ی بێته به ربه ست له تێکه ڵاو بوون و په یوه ندیه کانیدا شیوعیه کان له په یوه ندیه کانیاندا ئه و جۆره نه ریته یان ره چاو ده کرد، وه له به ئه وه ی فاخر کوڕی بنه ماڵه یه کی عه شایرو خاوه ن دیوه خانه بوو، کارێکی زۆر ئاسایی بوو که ئه م جۆره هه ڵس وکه وت و خزمه ت گوزاریه ی لێ ره چاو بکرێ.پاش بڕیاری لێبوردنی گشتی، فاخر ئازادکراو گه ڕایه وه موصل،

تا سالی ۱۹٦۲له موصل مایه وه.دواتر هاته هه ولێرو ماوه یه کی کورت له وێ مایه وه سه ردانی مێرگه سوری کرد.شۆڕشی ئه یلول نزیکه ی سالێك بوو ده ستی پێ کردبوو، مه لا مسته فا له هاتنه وه ی فاخر بۆ مێرگه سور زۆر دلته نگ بوو، بۆیه بڕیاری ده رکرد به هه ر شێوه یه ك بێت بیگرن،به لام فاخر خۆی به ده سته وه نه دا،چه ند ڕۆژێك خۆی له شاخه کانی ئه و ناوچه یه حه شاردا، تاگه یشته وه هه ولێر فاخر له و ماوه یه ی که له هه ولێر مایه وه زوو زوو سه ردانی به شی ناوخۆی قوتابی یه کانی ده کرد، سه عیدو جه وهه رو مه جیدی برای له وێ ده یانخوێند کوڕه کانی شێخ سلێمان بارزانی-یش له وێ بوون ڕۆژێکیان ده بێته شه ڕیان چونکه سه عیدو جه وهه رو براکانی تری کوڕه کانی شێخ سلێمان به گه وره ی خۆیانیان نه زانیوه ، ئه و ڕقه لای ئه وان هه ر ده مێنێته وه و ئه ستورتر ده بێت له سالی ۱۹٦٥ دا ، کاتێ که ڕه بیعی کوڕی شێخ محه مه د خالد ژن دێنێ عبدالباری کوڕی شێخ سلێمان که ده ستێکی سه قه ت بوو له ژێر سێبه ری ته قه ی خۆشی هه ولی کوشتنی سه عیدی داوه هه روه ها عبدالمهیمن که ئه ویش کوڕی شێخ سلێمانـه، که سی سێ یه م بوو له باره گای بارزانی له سالی ۱۹۷٥ دا، له قه تلو عامکردنی بنه ماله ڕۆلی جێ به جێ کردنی بڕیاره که ی بینیوه.*

له سه ر بڕیاری حزب فاخر هه ولێریشی به جێ هێشت و له کۆتای۱۹٦۲داچووه که رکوك.له که رکوك به رده وامی به خه بات و تێکۆشانی خۆی دا،ئه و خانوه ی که حزب بۆی گرتبوو له گه ڕه کی (شاترلو)،باره گای ڕۆژنامه ی (ڕێگای کوردستان)بوو، له ته ك کاری ڕێکخستنی ئیشه کانی چاپخانه شی به ڕێوه ده برد زۆر له به یاننامه کانی ئه وساکه ی حزب به ده ست و په نجه ی ئه و له چاپ دراون.کاك ممتاز حیدری که نازناوی(حسن)بوو،ماوه یه ك له وێ بوو وله گه ل فاخردا کاری ده کرد.

## (ئاشت بوونه وه له گه ل مه لا مسته فا)

دوای کوده تای (۸)ی شوباتی۱۹٦۳، حزبی شیوعی نه یتوانی له ناو شاره کان دا بمێنێته وه، له مانگی مارت دا فاخر مێرگه سوری که

* ،روانه دیسان به ندیخانه

که رکوکی بە جێ هێشت،سەرەتا بنکەی حزبیان لە خۆرنەوەزان کردەوە، مامۆستا همزه عبدالله لە دوای گفتوگۆی حکومەت و شۆڕش دەچێتە لای بارزانی و باسی فاخری بۆ دەکا،وای لێ دەکا لەگەڵی چاك ببینێتەوەو ئاشت بێتەوە.بۆیە فاخر لە مانگی تەممووزدا لە خۆرنەوەزانەوە دەچێتە ئاوەگرد،لە وێشەوە دەچێتە (کانی گوێز) لە ناوچەی شەقڵاوە، کە ئەوکاتە حەمەد ئاغای باوکی ئامر هێزی سەفین بوو.نزیکەی سێ مانگ لای باوکی دەمێنێتەوە.لە وماوەیەدا لەگەڵ هێزەکانی حزبی شیوعی و هێزی سەفین.چەندین چالاکی سەربازی گەورە ئەنجام دەدەن.لە نزیك مەسیف دا بەسەدان سەربازی مەر لە هەرکیە کان دەگرن و تەسلیم بە شۆڕش ئەکەنەوە،هەروەها لە هێرشەکانی حکومەت بۆ سەر ناوچەی(هیران و نازەنین) ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێ،هێزی پێشمەرگە بە سەرکردایەتی حەمەدئاغا بوو،توانی هێرشەکەی حکومەت بشکێنێ.لە شەڕەکانی دەربەندی کۆڕێش بە شداری کرد. لە وماوەیە کورتەدا فاخر سەرنجی سەرکردایەتی شۆڕش و بارزانی ڕاکێشابوو،هەروەها باوکی وچەندین کەسایەتی تر هەوڵەکانیان بەردەوام بوو بۆ ئاشت کردنەوەی فاخر و بارزانی.لەوسەردەمانەش بوو کە(حسین)ی براگەورەی لە بەرگری کردن لە خاکی بارزاندا شەهید بوو، بارزانی ئەوکاتە

سەرقاڵی سەرکردایەتی کردنی شەڕی ناوچەی(پیرس) بوو لەگەڵ حکومەتدا،بەدوای حەمەد ئاغا و فاخری ناردوو،کلاشینکۆفێکی بەدیاری داین. بەم جۆرە پەردەیەکی نوێ لە پەیوەندی نێوان مەلامستەفاو فاخر کرایەوە،نزیکەی حەوت ڕۆژ لە بارزان مانە-وە.پاش گەڕانەوەی،حزبی شیوعی ئەم ئاشت بونەوەیەی فاخرو بارزانی بەهەل زانی وفاخری گواستەوە بۆ لیژنەی ناوچەی باڵەك لەگەلاڵە. ئاشت بونەوەی بارزانی لەگەڵ فاخردا،دەرگای لەبە-ردەمدا کرایەوەو دەستی والاتربوو،ئیتر وەك کادرێکی سیاسی و سەربازی لە ناو ڕیزەکانی حزبی شیوعیدا تادە هات زیاتر دە ناسرا. بەتایبەتی دوای شەڕەکانی(حسن بگ)و(سەری بەردی)* لەو شەڕەدا زۆر قارەمانانە توانیان هێزەکانی حکومەت بشکێنن و

* دوو چیای ستراتیژی– ین لە ناوچەی ڕواندوز

زەرەرو زیانێکی زۆری لێبدەن.
ملازم عبدالرحمن کە کادرێکی عەسکەری حزبی شیوعی بوولەو شەڕەدا بریندار بوو.
هەروەها لە سەرەتای ١٩٦٤،مەفرەزەیەکی پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی بە سەرکردایەتی فاخر هەلیان کوتایەسەر ڕەبیەک لە پشت حامیەی ڕەواندز،کە شوێنێکی ستراتیژی هەبوو، ئەگەرچی فاخر بریندار بوو، بەلام مەفرەزەکەی توانی ڕەبیەکە بگرێ.لە شەڕی (کۆڕەك) یشدا لە نێوان١١/٨/١٩٦٥_٢١/٨/١٩٦٥دا کە بە یەکێك لە درێژترین شەڕەکانی ئەو ساتە دادەنرێ.کاك مستەفا چاوڕەش* دەڵێ:شەڕەکە لە پێناو گرتنی(ئەشکەوتی سیخوران وکانی کوێز) بوو، پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی، هێزی سەرەکی ئەو شەڕەبوون،لەگەڵ هێزێکی باڵی مەکتەبی سیاسی کە تازە لەهەمەدان گەڕابونەوە بە سەرپەرشتی کەمال میران بوو،بەلام هێزەکە هەمووی لە ژێر سەرکردایەتی فاخر مێرگەسوری دابوو.ئەگەرچی لە وشەڕەدا هەموو چیای کۆڕەك ئەگیراو نزیکەی(٢٠)یش لە هەردوو هێزەکەی حزبی شیوعی وباڵی مەکتەبی سیاسی بونە کۆچی قوربانی،بەلام گرتنی چەند شوێنێکی ستراتیژی لە کۆڕەكدا بۆخودی فاخر سەرکەوتنێکی گەورەبوو. بە مجۆرە فاخری...کادیری حزبی شیوعی لە دوای بوون بە پێشمەرگەو ئاشت بوونەوەی لەگەڵ بارزانیدا،لەلایەن پارتی و بنەماڵەی بارزانی هیچ جۆرە ئاستەنگێکیان بۆ دروست نەدەکرد بە پێچەوانەوە بەڕێزو گەورەیی یەوە تەماشایان دەکرد،بەم جۆرە ڕۆژ بەڕۆژ پەیوەندی فاخرو بارزانی و کورەکانی بەهێزتر دەبوو وهەمیشە وایان نیشان دەدا کە یەکێکە لە بنەماڵەی بارزانی، نەك وەك کادیرێکی شیوعی.
ئەم جۆرە پەیوەندیە ڕۆژ بەڕۆژ پتەوتر دەبوو تاساڵی ١٩٧٠هیچ گۆڕان و وەرچەرخانی بەسەردا نەهات کەبەرەو ئاقاری سەرهەلدانەوەی ناکۆکیەکان بچێت و بۆنی ئەوەی لێ بێ کە نێوانیان روو لە خراپی یە.

---

• چاوپێکەوتنی تایبەت هاوینی ١٩٩٦

# سەرکەوتن و دەسەڵات

لەکۆتایی ١٩٦٧، مەلا مستەفای بارزانی ناکۆکیەکانی نێوان فاخرو حزبی شیوعی قۆستەوە، بایەخێکی بێ وێنەی پێ دا، هێشتا ئەو هەموو پەیوەندیەکانی بەحزبی شیوعی یەوە نە پچڕاند بوو کە بارزانی زۆرجار بەئیشی عەسکەری و سیاسی تەکلیفی دەکرد.

لەدانوستانی نێوان حکومەتی عبدالرحمن عارف و شۆرش دا، بارزانی فاخرو هێزەکەی راسپارد کە هێڵی نێوان بەرزێوەو دیانا بپارێزێ، هەروەها لەمانگی تشرینی دووەمدا بارزانی بانگی کردو، داوای لێ کرد ناوچەی (بەمۆ) رزگار بکا، ئیدریس بارزانی رۆڵێکی دیاری هەبوو لەنزیك بوونەوەی فاخر لەبنەماڵەی بارزانی، لەهەموو کۆبوو دانیشتنێکدا وەك براو کوڕی بارزانی لەقەڵەم دەدا، بارزانی زۆر پێویستی بەفاخر هەبوو، لەلایەك بۆ ئەوەی لەحزبی شیوعی دوور بخاتەوە، لەلایەکی دیکەش بۆ ئەوەی سوود لەتواناو لێهاتوویی ببینێ و بیخاتە ژێر فەرمانی خۆی چونکە مانەوەی لەناو حزبی شیوعیدا، بەمانای ئەوە بوو کە هەموو دەسەڵاتی بەسەردا نەدەشکا.

ئەگەر چی پەیوەندیەکانی فاخرو بارزانی لەنێوان (١٩٦٧_١٩٧٠) بەچەندین هەورازو نشێودا تێ پەریوە، بەلام لەهەمان کاتدا بەماوەیەکی زێرین دادەنرێ لەپەیوەندی نێوانیاندا، رەنگە بۆ فاخریش بەماوەی هاتنە دێی خەونە شەخصیەکانی خۆی دابنرێ، چونکە لەو ماوەیەدا توانی سنوری ناوبانگی خۆی زیاتر فراوان بکات، لەگەرمیانەوە بگرە تا دەگاتە شارەزوورو دۆڵی جافایەتی و ناوچەی سلێمانی و پشدەرو بتوێن و باڵەکایەتی، فاخر مێرگەسوری وەك سەرکردەیەکی ناودار.. ناوبانگی بڵاوبووەوە.

فاخر لەو شوێنانەدا کەلێپرسراو بوو هەمیشە خاوەن بڕیاری خۆی بوو، زۆر جار وا رێ کەوتوە بڕیاری وای داوە، بێ ئەوەی پرس بەبارزانی بکا، دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٦٨دا ناوچەی بەمۆی رزگار کرد، بۆ رێکخستنەوەی هێزەکان کەوتە جموجۆڵێکی زۆر توانی لەماوەیەکی کورتدا، ئاڵوگۆڕێکی زۆر لەناو هێزەکاندا بکا، هەندێ

له بڕیاره‌كانی فاخر به‌ دڵی بارزانی نه‌بوو، بۆیه‌ بارزانیش وه‌ك حزبی شیوعی بڕیاری ته‌جمیدكردنی داو له‌ مانگی ١٩٦٩/١ بێ ئیش و كاربووه‌

ئه‌و بڕیاره‌ی بارزانی نه‌بووه‌ هۆی له‌ق بوونی شوێن پێ ی فاخر، به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ بارزانی بۆ لێدانی كۆمپانیای نه‌وتی كه‌ركوك ساڵی ١٩٦٩ فاخری ده‌ست نیشان كردو ئه‌ویش كاره‌كه‌ی زۆر به‌ ڕێكی ئه‌نجام دا.

به‌داخه‌وه‌ پارتی له‌ نووسینه‌وه‌ی مێژووی خۆشیدا ده‌یه‌وێ ڕاستیه‌كان چه‌واشه‌ بكات، له‌ باسكردنی لێدانی بیره‌كانی نه‌وتی كه‌ركوك دا ده‌یه‌وێ ڕۆڵی مێرگه‌سوری به‌ ئاوه‌كی له‌قه‌ڵه‌م بداو ئه‌و ئه‌ركانه‌ی كه‌ به‌ سه‌ركردایه‌تی فاخر ئه‌نجام دران بیانخاته‌ پاڵ كه‌سانی دیكه‌وه‌.

سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی ئه‌م چالاكیه‌ عه‌سكه‌ریه‌ كه‌م وێنه‌یه‌ له‌ مێژووی شۆڕشی ئه‌یلول دا، به‌ڵام سه‌ر ئێشه‌یه‌كی زۆری بۆ فاخر نایه‌وه‌، به‌ تایبه‌تی دوای به‌یاننامه‌ی ئازار ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ به‌ پیاوی ئینگلیز ناسرابوون وه‌ك (شه‌فیق ئاغا كه‌ به‌لاین ناوی ده‌ركرد بوو، كه‌ماڵی شێخ غه‌ریب) دژایه‌تیان ده‌كرد.

دوا به‌دوای لێدانی كۆمپانیای نه‌وت، جارێكی دیكه‌ بارزانی ته‌جمیدی كرده‌وه‌ تا مانگی نیسانی ١٩٦٩، تاكو ئێستاش دیار نی یه‌ بارزانی بۆ به‌م جۆره‌ ره‌فتاره‌ی له‌گه‌ڵ فاخردا كردووه‌.

فاخر خۆشی له‌ نامه‌یه‌كدا ئاماژه‌ بۆ هیچ هۆ ناكا كه‌ بۆچی مه‌لا مسته‌فا فاخری دوور خستۆته‌وه‌، به‌ڵام ته‌نها دوور خستنه‌وه‌ی چه‌ندین مانا هه‌لده‌گرێ، چه‌ندین پرسیار دروست ده‌كات!

ئایا بارزانی هه‌ر به‌ ڕووكه‌ش له‌گه‌ڵ فاخر ئاشت بوبوه‌وه‌؟ ئایا ئه‌و رق و قینه‌ی كه‌ به‌رامبه‌ر فاخر هه‌یبوو ره‌ش بوبوه‌وه‌ یان نا؟ به‌ ڕاستی هیچ به‌ڵگه‌یه‌ك له‌ به‌ر ده‌ست دا نی یه‌ كه‌ گوزارشت له‌و هه‌ڵوێسته‌ی بارزانی بكا، ته‌نها ئه‌وه‌ نه‌بێ كه‌ فاخر له‌ چالاكیه‌ عه‌سكه‌ریه‌كانیدا بڕیاری ده‌ست به‌ جێی ده‌دا، بێ گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ سه‌ره‌وه‌، ئه‌و سه‌ربه‌خۆییه‌ له‌ ئیراده‌و بڕیاردا وای له‌ ئیدریس بارزانی كرد كه‌ چه‌ند جارێك فاخر سه‌ر زه‌نشت بكا، به‌ڵام نابێ

ئەوەش لە یاد بکرێ کە ئەم هەڵوێستەی فاخر بەشێک بوو لە پێکهاتەی سیاسی و فیکری و عەسکەری و شەخصی خۆی و رەنگە هەر ئەو سیفەتەی فاخر بوبێ کە زۆر جار پەیوەندی نێوان خۆی و سەرکردایەتی حزبی شیوعی و دواتریش سەرکردایەتی بارزانی گەیاندبێتە ئاقاری گومان لێ کردن.

زۆری نەبرد جارێکی دیکە بەفەرمانی مەلا مستەفای بارزانی گەڕایەوە سەر ئیشەکانی خۆی، بەڵام تا ڕزگارکردنی قەڵادزێ بارزانی ئیشێک و مەسئولیەتێکی دیاری بۆ دەست نیشان نەکرد.

لە ١٩٦٩/٤/١٧... بەفەرمانی مەلا مستەفا، سەرکردایەتی

ئ وشێرشەی کرد کەلە ئەنجامیدا شاری قەڵادزێ لە ١٩٦٩/٥/٢٢ پێ ڕزگار کرا.

لەهەر شوێنێک هێزەکانی پارتی توشی شکست بونایە، بارزانی فاخری رادەسپارد بۆ راست کردنەوەی پارسەنگی هێزەکان.

خوالێخۆشبوو عومەر دەبابەو شەهید عەلی عەسکەری بەم شێوەیە باسی فاخر مێرگەسۆریان کردووە:«لەهەر شوێنێک هێزەکانی پارتی تووشی شکست ببوایە، فاخر مێرگەسۆری وەک ئاگرێک لەپووش بەربێ، ئا ئەوها بەرەنگاری ئێمە دەبووەوە».

دوای ئەوەی هێزی خەبات توشی شکستێکی گەورەبوو بوو، ئامێر هێزەکەش عەزیز ئەتروشی شەهید بوو، فاخر خۆی و هێزەکەی بۆ ڕزگار کردن و بەهانا چوونی هێزی خەبات سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناو هەموو ئەو شوێنانەی کەهێزی خەبات لەدەستی دا بوون، توانی بیانگێرێتەوە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی پارتی، ئەو بەهانا چوونەش هەر بەفەرمانی مەلا مستەفا بوو. بەم جۆرە فاخر لەزنجیرە چالاکیەکی عەسکەری دا، کەخۆی سەرپەرشتی دەکرد توانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنێ، شوێن پێی خۆی قایمتر بکات، بۆیە بارزانی کردی بەئامێر هێزی ڕزگاری کە ئەوە لەخۆی دا پلەو پایەیەکی بالابوو.

سنوری هێزی ڕزگاری زۆربەی ناوچەی جافایەتی دەگرتەوە، «ئەو ناوچەیە لەژێر کۆنترۆڵی هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو»، ژمارەی هێزەکەش زۆر کەم بوو، هەر دوای ئەوەی فاخر بوو بە ئامێر هێز

ژماره ی هێزه که گه یشته (٣٠٠٠) سێ هه زار که س، دوای ڕووبه ڕوو بونه وه یه کی توند له نێوان هێزه که ی فاخر مێرگه سوری و هێزه که ی باڵی مه کته بی سیاسی، هێزه که ی فاخر توانی زۆربه ی ناوچه که بخاته ژێر کۆنترۆڵی خۆی.

هه ر دوای ئه و مه سئولیه ته و سه رکه وتنه، فاخر له تۆمارکردنی سه رکه وتن و کۆنترۆڵ کردنی ناوچه ی تردا به رده وام بوو، ناوچه کانی کۆیه، خه له کان، شوان، قه لاسێوکه، قه ره داغ، ئاڵتون کوپری، کفری و که لاری ئازاد کرد.

به م جۆره فاخر مێرگه سوری له سه رکرده یه کی سه ربازی ناوچه یه کی ته سك و لێپرسراوی لیژنه ی مه حلی حزبی شیوعی یه وه بوو به لێپرسراوی ناوچه یه کی پان و به رینی حزبێکی نه ته وه یی خاوه ن ره گ و ریشه و جه ماوه رێکی زۆر که به هه زاران کیلۆمه تر مه زه نده ده کرێ.

له و ماوه یه کورته دا، که ده که وێته نێوان بوون به ئامیر هێزی ڕزگاری و ده رچوونی به یاننامه ی ئازار، فاخر لێپرسراوی (حزبی) ناوچه ی گه رمیان و سلێمانی-یش بوو، ده سه لاتێکی بێ سنوری بۆ خۆی په یدا کردبوو، ببووه لێپرسراوی بێ هاوتا، واته خۆی هه موو شتێك بوو.

## ( فاخرو حزبی سۆشیالسیت )

پێش به یاننامه ی یانزه ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠، فاخر جموجوڵێکی نائاسایی هه بوو، له شاخ له گه ڵ زۆر کادیرو ڕوناکابیردا باسی بارودۆخی فیکری ناو پارتی ده کرد، ده یویست به ره و لای چه پی ببات ماوه یه ك له «کلاوقوت» له ناوچه ی گه رمیان له گه ڵ چه ند که سێك باسی دروست کردنی حزبێکی سۆشیالسیتی ده کرد. له گه ڵ قادر جه باری و ره فیق چالاك دا کاریان بۆ ئه وه ده کرد، ئاگاداری زۆر کادیری کۆنی حزبی شیوعی و ڕووناکبیره کانی شاره کانیان کرده وه.

ژماره یه ك له و کادیرانه له سه ر داوای فاخر هاتنه ناوچه که و بیروبۆچوونی فاخریان له مه ڕ ئه و بیرۆکه یه بیست.*

* له وانه کاك محمدی مه لا که ریم، له لایه ن فاخره وه په یوه ندی پێوه کرابوو.

قادر جەباری* لەو سەردەمەدا کە یەکێك بوو لە ئەندامانی سەرکردایەتی حزبی سۆشیالیستی کوردستان، بە شانازیەوە باسی ئەو هەولانەی دەکرد، کە چۆن بیرۆکەی دامەزراندنی حزبێکی سۆسیالیستی کوردی هەر لە سالی ١٩٧٠ـەوە لە مێشکیدا چەکەرەی کردبوو.

دامەزراندنی حزبێکی کوردی، لە ناوچەیەکی ژێر دەسەلاتی بارزانی لەلایەن فاخر مێرگەسوری یەوە، بڕیارێکی ئاسان نی یە، گومانیش هەلدەگرێ، کە چۆن فاخر دەتوانێ لە بەرامبەر دەسەلاتی تاکەکەسی و عەشایری بارزانی دا ئەو کارە بکات؟!

یەکێك لەو کەسانەی کە چووبووە لای فاخرو کەئەو ساکەش هێشتا کادیرێکی پێشکەوتووی (ق.م)، لە فاخری پرسی بوو: چۆن دەتوانی حزبێکی لەو بابەتە دروست بکەی ئەگەر بارزانی ئاگاداری نەبێ؟

لەوەلامدا فاخر گوتبوی:«هیچ کارێك بێ ئاگاداری ئەو ناکەم».

دروست کردنی حزبێکی سیاسی، بە ئاگاداری بارزانی لە بنەرەتدا بیرۆکەکەی بە نەزۆکی لە دایك دەبێ، چونکە ناکرێ حزبێك بەسەر بەخۆیی لە دایك بێت، یان چاوەڕوانی ئەوەی لێ بکرێ کە بتوانێ ڕۆلێك بگێرێ لەسەر گۆڕەپانی بزافی ڕزگاریخوازی کورد، لەکاتێکدا ئیجازەی لەدایك بوونی لەلایەن بارزانی یەوە پێ بدرێ.

ڕەنگە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەو جۆرە حزبەش بەفیتی بارزانی بوبێت بۆ دروست کردنی بەر بەست لە بەردەم گەشە کردنی حزبی شیوعی عێراقیدا.

بە هەر حال... هەر وەك چۆن ئەم بیرۆکەیە بە نەزۆکی هاتە دونیاوە، هەرواش کۆتایی هات چونکە دوای دەرچوونی بەیاننامەی ئازارو ڕێککەوتنی بارزانی و حکومەتی بەغدا، فاخر کۆتایی بەو هەولانەی هێنا.

* * *

شیاوی گوتنە... مانەوەی فاخر لە ناوچەی حەقەکان دا، سەرنجی بۆ شێوازی ژیان و پەیوەندیە کۆمەلایەتی و ئابووری و ئاینی و تەریقەتی جێ بەجێ کردنی داب و نەریتە ئاینیەکان ڕاکێشابوو،

* قادر جەباری : ئێستا ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

بۆیه كه وته كۆكردنه وه ی زانیاری، بۆ ئه وه ی له دوو تویٚ ی كتێبێكدا بینوسێته وه به به راورد له گه ڵ شێوازی ژیان و په یوه ندیه كومه لایه تی و ئابووری و ئاینی و ته ریقه تی نه قشبه ندی شێخی بارزان (خودان).

به داخه وه ئه و كتێبه ده ست نووسه تاكوسالی ١٩٧٦ مابوو، به لام دواتر هێزێكی ئیستخباراتی حكومه ت هه موو كتێب و ده ست نووس و یادداشته كان كه لوپه لی تایبه ت و نه خشه یان له مالی فاخر مێرگه سوری بردو به م جۆره ئه و ده ست نووسه فه وتا.

## له گه ڵ هێلی چه پی حزبدا

له سه ره تای سالی ١٩٦٤دا، كۆمه له كادیرێكی حزبی شیوعی له به غدا پێكه وه كۆده بوونه وه و باسی وه زعی ناوخۆی حزبیان ده كرد، ئه و كۆمه له كادیره، پێیان وابوو سه ركردایه تی حزبی شیوعی ئه وساكه (عامر عبدالله، سلام الناصري، بهاءالدين نوري، باقر ابراهيم و....تد)، له هێلی فیكری و سیاسی حزب لایان داوه، بۆیه بیریان له وه ده كرده وه كه هێلێكی به رهه لستكار له به رامبه ر ئه و سه ركردایه تی یه دروست بكه ن، كۆمه له كادیره كه به سه ركردایه تی ابراهيم علاوي بوو، له گه لیاندا چه ند كه سایه تی یه كی ناسراوی ناو حزب، وه ك «نوری كمال العانی، امین خیون، خالد احمد زكی، فاروق مه لا مسته فا» كاریان ده كرد، له هه مان كاتدا ئه و هێله له ڕێگای ڕۆوف ـ ی حاجی قادره وه په یوه ندی به ژماره یه ك ئه ندامی دیكه ی حزبه وه هه بوو، له وانه كه له شاخ بوون.

(ره ؤوف) ئه ندامی لقی كوردستانی حزبی شیوعی بوو، كادیرێكی لێهاتوو و به توانا بوو، تابلۆ ی شۆرشگێرو ئازا بوو، پرولیتاریه كی ته واو بوو، ماوه یه كی زۆر كرێكاری نه وت بوو له كه ركوك، باشترین فیته ری ئۆتۆمبیل بوو، له سالی ١٩٤٨ به سه رۆكی (لقی ناوه ندی ئیوارانی سلێمانی یه كێتی گشتی قوتابیانی عێراق هه لبژێردرا)، له هه مان كاتدا زۆر رووناكبیر بوو، ئه گه رچی خوێندنی ناوه ندیشی بۆ ته واو نه كرا بوو، به لام زمانی ئینگلیزی باش ده زانی، له كه ركوك فێری توركیش بوو بوو، له زیندانیشدا عه ره بی زۆر باش فێربوو، زمانی فارسیشی ده زانی، ماوه یه كیش له ڕومانیا ژیا بوو، بۆیه زمانی

ڕومانیشی دەزانی، سیمای ڕووناکبیری لە قسەو گفتوگۆکانیدا، زۆر بەئاسانی بەدیار دەکەوت، لە ڕویشتن وهەڵس و کەوتی پێشمەرگایەتیشدا زۆر توندوتۆڵ بوو، ماوەیەکی زۆری بە زۆر کەم دەبڕی.

لەژیانی حزبایەتیشدا تا بڵێی شارەزا بوو، زۆر بەئاسانی هاتووچۆی نێوان شاخ و سلێمانی و هەولێرو بەغدای دەکرد، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ، ئەو رەوشتانەی رەئوفی حاجی قادر، وای کرد بووکە بتوانێ گەنجەکانی هێڵی چەپی حزبی شیوعی لەخۆی کۆبکاتەوە، بۆیە لەلایەن سەرکردایەتی راستڕەوی حزبەوە خۆشەویست نەبوو، تا ئەو رادەیەی کومانیشیان لێ دەکرد، چونکە بیرۆکەی کودەتای حزبی و شۆڕشی فیکری دژ بە سەرکردایەتی هێڵی راستڕەو هەمیشە لە مێشکیدا دەخولایەوە.
هەر لەساڵی ١٩٦٤دا ئەو کۆمەڵە کادیرە بەسەرکردایەتی ابراهیم علاوی یادداشتێکیان بۆ لیژنەی مەرکەزی حزب بڵاوکردەوە، یادداشتەکە بەناوی (فریق من کوادر الحزب) بوو، بۆیە دواتریش ئەو کۆمەڵە هەر بەوناوەوە ناسران، لە یادداشتەکەدا رەخنەو گلەیی زۆریان لە سەرکردایەتی ئەو سەردەمەی حزب کردبوو، بە «تحریفی، یمینی، تصفوی» ناوی بردبوو، لە یادداشتەکەدا هەموو بیرو بۆچوونیان بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەوڵ و کۆششانە بوو کە سەرکردایەتی ئەوساکەی حزب بۆ یەکبوون لەگەڵ تەیاری نەتەوەیدا کاری بۆ دەکرد، کە دواتر بە هێڵی ئاب ناسراون و لەگەڵ (الاتحاد الاشتراکي)دا کە «فؤاد الرکابی» سەرۆکایەتی دەکرد یەکیان گرتەوە.
ئەو یادداشتە لەناو رێکخستنەکانی شاخیشدا کاریگەری خۆی نواند، ئەندام و لایەنگیرانی ئەو هێڵە کەوتنە قسەو باس و رەخنەگرتن لەسەرکردایەتی راستڕەوی حزب.
رەئوف ـ ی حاجی قادر سەرکردایەتی هێڵی نای شاخی دەکرد، زۆریش لە فاخر مێرگەسۆری نزیك بوو، دووریش نی یە کە سایەتی سیاسی و ڕوناکبیری رەئوف لەکەسایەتی سیاسی فاخر رەنگی

دابنێته وه، فاخر ئه و ساکه ئه ندامی لیژنه ی مه حه لی بوو، بۆ گه نجێکی وه ك فاخر به پێ ی په یڕه ی لێپرسراویه تی ئه ر کات ئه و مه سئولیه ته که م نه بوو، به لام هه میشه له به ختی خۆی قایل نه بوو، له هه مان کاتیشدا چه پێکی توندڕه و بوو، بۆیه له گه ڵ ره ئوف ـ ی حاجی قادر خۆی له ناو (فریق من كوادر الحزب) دا دیته وه فاخر به ئاشکرا که وته دژایه تی کردنی سه نگه ری هێڵی راستره وی حزب.

دوای بلاوبونه وه ی یادداشتی (فریق من كوادر الحزب) و به دیارکه وتنیان وه ك هێڵێکی جیا له حزبدا، ره ئوف له ساڵی ۱۹٦٦ دا چووه به غدا له وێ ابراهیم علاوی و فاروق ـ ی مه لا مسته فا چه ند کادیرێکی دی ئه و هێڵه ی بینی.

، دیاره ره ئوف زۆر به باشی باسی فاخری بۆ ابراهیم علاوی کردوه، وه ك کاك فاروق ـ ی مه لا مسته فا که له چاوپێکه وتنێکی تایبه تدا بۆی گێرامه وه*، به ابراهیم علاوی وتبوو: ده که وێ وه ك سه رکرده یه کی عه سکه ری و سیاسی له کوردستاندا سوود له فاخر وه رگیرێ، بۆیه ابراهیم علاوی له کۆبونه وه یه کی (فریق) دا فاخری به ئه ندام و کادیری (فريق من كوادر الحزب) به هاوڕێیانی خۆی ناساندبوو.

(فریق) له و باوه ره دا بوو که به پشت به ستن به باروودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمه لایه تی ده کرێ له خوارووی عێراق و کوردستان، راپه ڕین به رپابکرێ، بۆ ئه م مه به سته (عزيز خيون) یان بۆ خوارووی عێراق له ناوچه کانی هۆڕو زه لکاوه کاندا هه لبژاردو که دواتر هه ر له وێ شه هید بوو، بۆ کوردستانیش فاخر مێرگه سوری هه لبژارد.

ململانێ و ناکۆکی له نێوان باله کانی حزب زۆر توند ببوو، جگه له ابراهیم علاوی (عزيز الحاج) یش که لای خۆیدا خه ریکی خۆ کۆکردنه وه بوو دژی هێڵی راستره وی حزب، وه ئه گه ر چی (عزيز الحاج) سواری ئه سپی چه پ ببوو، به لام سه ره نجام له ژێر ناونیشانی (القيادة المركزية) له حزب جیابوه وه.

ئه گه ر چی (فریق) له گه ڵ (القيادة المركزية) ناکۆکی و ململانێ ی

---

* چاوپێکه وتنێکی تایبه ت، ۱۹۹۷ ــ سلێمانی.

فیکریشیان له نێواندا هه بوو، به لام (فریق) چووه ناو (القیادة المرکزیة)و له گه لیدا یه کیان گرته وه.

د. عزالدین مصطفی رسول* که له گه ل (القیادة المرکزیة) دا بوو، زۆر دۆستی فاخر بوو ده ڵێ: دوای بانگه شه کردنی جیابوونه وه، فاخر نامه یه کی بۆ نوسیم، پیرۆزبایی لێ کردم و گوتبوی، کارێکی چاکتان کردووه، من ئاماده م هه موو شتێکتان بۆ بکه م.

محمود دیکتاریوف*، که پێشمه رگه یه کی ئازای حزبی شیوعی بووه هه ر له گه ل حزبیش مایه وه ده ڵێ: دوای ئیعلان کردنی جیابوونه وه ی فاخر چووه ریزی (ق.م) و هێزێکی چه کداری ئاماده کرد بۆ ئه وه ی ده ست به سه ر باره گاکانی حزب دا بگرێ له ده رگه له.

به لام ئایا فاخر به ئاشکرا چووه ناو ریزه کانی (القیادة المرکزیة)ه وه؟

عزیز الحاج سالی ١٩٦٧ دا چووه ناوچه ی باڵه ك، به ر له وه ی مه لا مسته فا بارزانی ببینێ، فاخری بینیبوو، به ناوی حزبه وه داوای لێ کردبو، وه ك سه رکرده یه کی عه سکه ری له گه ل بارزانیدا بمێنێته وه، چونکه ئه و کاته فاخر، دوای شه ڕی هه ندرێن ناوی ده رکردبوو، ته نانه ت وه ك قاره مانی شه ڕ له قه له م درا.

ابراهیم علاوی که یه کێك بوو له سه رکرده کانی (القیادة المرکزیة) له نوسینێکدا سه باره ت به و رایه که فاخر له سه ر فه رمانی (القیادة المرکزیة) له گه ل پارتی ماوه ته وه له ژماره (٩) ی «الغد» له ئازاری ١٩٨١ ده نووسێ: «اننا اذ ننشر هذه الوثیقة، وهي رسالة کتبها فاخر لاحد خلصائه، نرى لزاما علینا ان نذکر اننا نتحمل مع جمیع الغیارى على مصیر کردستان عواقب ذلك الخیار.. فان کان في ذلك شیء من الحیف فنحن لانبرأ من العهدة فیه».

له چاوپێکه وتنێکی تایبه تی له گه ل کادیرێکی پێشکه وتووی (القیادة) دا، هۆی ئه و بریاره ی عزیز الحاج به م شێوه یه ی لێك دایه وه: فاخر کادیرێکی سه ربازی گه وره بوو، دوای شه ڕی هه ندرێن، زیاتر له بارزانی و ئیدریس نزیك ببوه وه، قسه ی ده ڕۆیشت

---

* چاوپێکه وتنێکی تایبه ت، هاوینی ١٩٩٦ــ هه ولێر.

* چاوپێکه وتنێکی تایبه ت ١٩٩٧ سلێمانی

ئه گه ر له گه ڵ ئێمه دا به ئاشکرا کاری کردبا ره نگه ئه و رۆڵه ی له ده ست ده دا، ئه مه ش به زیانی حزب (القیادة) ده گه ڕایه وه، که پێویستی به وه هه بوو شوێنی کادیره کانی له ناو شۆڕشدا بپارێزێ.

به مجۆره فاخر مێرگه سوری هه ر له سالی ١٩٦٤ دا، خۆی له ناو ململانێ ی هزرو حزبایه تی بینیه وه وه وه ك شیوعیه كی چه پ و له هه مان كاتدا توندڕه ویش، دژی سه ركردایه تی حزب بوو، دوریش نی یه ته جمید كردنی له سالی ١٩٦٤ و دوور خستنه وه ی له گه لاڵه بۆ رانیه هه ر له به ر ئه و هه ڵویسته فیكری و سیاسی یه ی بوو بێت، ئه گه ر چی فاخر له نامه یه كیدا ده ڵێ ئه و دوورخستنه وه بێ هیچ هۆبوو.

هه ر چۆنێك بێت فاخر له ناو گه مه ی ململانێ ی فیكر سیاسه تدا، له بازدانی له سه كۆی (حزب) بۆ سه كۆی (فریق) و ئینجا (القیادة) وه، نه یتوانی هه ڵوێستێكی سیاسی ئه گۆڕی هه بێ، به پێچه وانه وه ڕاڕای و په ت په تێنێكی له گه مه كه دا هه ڵبژاردبوو، كه دواتر به زیانی سیاسی خۆی گه ڕایه وه.

ململانێ و ناكۆكی فاخر له گه ڵ حزب، به تایبه تی سه ركردایه تیه كه ی له چه ند هه ڵوێستی سیاسی و عه-سكه ری وشه خصیشدا به دیار ده كه وێ.

پێش ئه وه ی بهاءالدین نوری ببێته لێپرسراوی لقی كوردستانی حزبی شیوعی ماوه یه ك (ستار خضیر) رۆڵی كه سایه تی یه كه م له كوردستاندا ده بینی، فاخر په یوه ندی له گه ڵ هاوڕێ ستار خۆش بوو، هیچ جۆره ناكۆكی و ململانێ یه ك له نێوانیان دا نه بوو، هه روه ها له گه ڵ ئه ندامانی لقی كوردستان كه دواتر بوو به هه رێمی كوردستان، په یوه ندی باش بوو.

به ر له شه ری هه ندرێن (١٩٦٦) بهاءالدین نوری بووه لێپرساوی حزب له شاخدا، وه ك كادیرو پێشمه رگه و به ر پرسه كانی حزب بۆیان گێرامه وه، مامۆستا بهاءالدین له ره فتارو مامه له كردنیدا زۆر توندو تیژ بوو، ته نانه ت كه س له به رامبه ریدا نه یوێراوه قسه بكا، جگه له وه ش مامۆستا بهاءالدین نوری نوێنه ری هێڵی راستی حزب بوو، چونكه هاوبه شی هێڵی ئاب بوو، كه ده قاو ده ق له گه ڵ ئه و هێڵه ی كه فاخر كاری تێدا ده كرد پێچه وانه ی یه كتری بوون، جگه له وه ی ئه ستێره ی فاخر دوای سه ركه وتنه كانی هه ندرێن له گه شه دا بوو،

ئه و سه رکه وتنه دواتر ده شێ بوبێته هۆی ئه وه ی که هه ندێ له خۆی بایی ببن، بۆیه له وانه یه دیسپلین و فه رمانی حزبی به ته واوی جێ به جێ نه کرد بێ، یان هه ر نه بێ به دڵی نه بوو بێ و خۆی لێ دزیبێته وه.

ته قینه وه ی ناکۆکیه کان له نێوان فاخرو سه رکردایه تی راسته وی حزبی شیوعی دا، هه ر دوا به دوای هاتنی مامۆستا بهاءالدین نوری به دیار که وت.

یه کێك له هۆیه کانی ئه و ناکۆکیه نه رم و نیانی مامۆستا بهاءالدین بوو، له به رامبه ر جیابوونه وه ی باڵی مه کته بی سیاسی(باڵی ابراهیم احمدو جلال تاڵه بانی) له پارتی و بارزانی دا.

ئه گه ر چی حزبی شیوعی دژی ئه و جیابونه وه وه ستا، به ڵام له هه مان کاتدا هه ڵوێستی سه ربه خۆی خۆیان پاراست، حزب نه که وته ژێر کاریگه رێتی و ته نانه ت گه فه کانی بارزانی، ئه گه ر چی پێشمه رگه کانی حزبی شیوعی له به ره کاندا، شه ڕیان له گه ڵ باڵی مه کته بی سیاسی ده کرد، به ڵام له هه مان کات دا، فه رمانی بارزانی ره ت کرده وه حزبی شیوعی له ڕێگای ڕێکخستنه کانی خۆیه وه بۆ کوشتنی (ابراهیم ئه حمه دو جه لال تاڵه بانی).

هێڵی چه پ له حزب دا له شاخ که ره ؤوف ـ ی حاجی قادر نوێنه رایه تی ده کرد دژی ئه و نه رم و نیانیه ی بهاءالدین نوری بوو، بۆیه فاخر مێرگه سوری ـ یش به ئاشکرا دژی هه ڵوێستی حزب وه ستاو له و به یاننامه یه ڕازی نه بوو که حزبی شیوعی به ئیمزای بهاءالدین نوری سه باره ت به جیابونه وه ی باڵی مه کته بی سیاسی ده ری کرد، ماموستا بهاءالدین نوری له و باره یه وه ده ڵێ:«له هاوینی ١٩٦٦ ئیبراهیم ئه حمه دو جه لال تاڵه بانی و به شی زۆربه ی ئه ندامانی مه کته بی سیاسی، کوردستانیان به جێ هێشت چوونه پاڵ حکومه ت،

ئێمه وه ك حزبی شیوعی دژیان وه ستاین، به ڵام هه ڵوێستی سه ربه خۆی خۆمان راگرت، وه دژایه تیه که ش نه گه یشته ئه و راده یه ی که مه لا مسته فا ده یویست، به لقه چه کداره کانی خۆمان ووت شه ڕیان بکه ن، فاخر له هه ڵوێستی ئێمه رازی نه بوو، ده یویست توندتر بین، زۆر گوشاری ده هێنا بۆ ئه وه ی به یان دژی ئیبراهیم ئه حمه دو جه لال تاڵه بانی ده ربکه ین و به خائینیان بزانین، به ڵام ئێمه

له هه رێمی حزب بڕوامان وانه بوو، له و باوه ڕه دا بووین که مه سه له کان قابیلی گۆرانن، به دووری نازانین که مه سه له که پێچه وانه بێته وه، مه لا مسته فا له گه ڵ حکومه ت بێت و ئیبراهیم ئه حمه دو ئه وان لێره بن».

هه روه ها ده ڵێ:«ئێمه هه ردوو باڵه که به دوو باڵی بزاڤی رزگاری نه ته وه یی کوردمان ده زانی، له م روانگه یه وه بۆیه‌ئه مان ده ویست دژایه تیه که ی ئێمه له تیروانینی مه لا مسته فا سه رچاوه بگرێت، چونکه ده مانزانی رۆژێك دێ پێکدێنه وه، ئه وه ته نها ره ئی من نه بوو ره ئی ابو حکمت، ملا احمد بانی خێلانی و حاجی ملاو... تد بوو».

سه باره ت به و هه ڵوێسته ی فاخر مامۆستا بهاءالدین به م جۆره ی لێك ده داته وه:«له حوزه یرانی ١٩٦٦ مه لا مسته فا ناردیه شوێن من، ئه و کات پاره گاکه مان له به رگه له بوو، مه لا مسته فاش له دیلمان بوو ملا احمد بانی خێلانی، عادل سلیم و ملازم خدر_ یشم له گه ڵدا بوون، سه عاتێك دانیشتین، پێ ی ووتم ئه و سه گانه م بۆ بکوژه ! !

منیش ووتم ئه زبه نی له به غدان، چه کداریان هه یه، له به غدا ئێمه حزبێکی نهێنین، بێ چه کین ناتوانین، زۆر هه وڵم دا باوه ڕی پێ بێنم بێ سوود بوو، بۆیه هه ڕه شه ی کردو وتی: کوشتنیان ئاسانه وه ك جگه ره کێشانی ئێستای عادل.

له دواتر پێم ووت:ئه زبه نی ئه و ئیشه به ئێمه ناکرێ، ئێوه حزبێ پاره تان هه یه، خه ڵکتان هه یه، ئه و کاره له گه ڵ ره وشت و نه ریتی حزبی ئێمه دا ناگونجێ».

به ڕاستیش ئه و هه ڵوێسته ی بهاءالدین ناکۆکیه کانی له گه ڵ مه لا مسته فا قوڵتر کرد، په یوه ندیه کانی هه ردوو لاشی خسته قاڵبێکی تره وه.

مامۆستا بهاءالدین نوری ده ڵێ:«له مانگی (١١)ی هه مان ساڵدا بۆم ده رکه وت که فاخر ژێر به ژێر په یوه ندی له گه ڵ بنه ماڵه ی بارزانی دروست کردبوو، پاره و پێداویستیشی له بارزانی وه رگرتبوو، فاخر خۆی ئیعترافی بۆ من کرد که وه هاب کۆیی که کۆنه شیوعی بوو، دواتر ببوو به پیاوی ئه من ته کلیفی کردبوو مام جه لال بکوژێ وه هاب کۆیی_ یش له نامه یه کدا بۆ فاخر سه عاتی سفری بۆ کوشتنی مام جه لال دیاری کردبوو، فاخریش بێ ئه وه ی چاوه ڕێ بکا، له هه مان سه عاتی سفره وه بروسکه ی بۆ بارزانی لێداو پێ ی گوتبوو حوکمی

ئیعدام بەسەر مام جەلال جێ بەجێ کرا، مەلا مستەفا فاش بروسکەکەی بەسەر هەموو بارەگاکاندا بڵاوکردەوە».

ماموستا بهاءالدین لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:«ئەو بروسکەو کارەی فاخر سەرنجی راکێشام، بۆیە کاغەزێکم بۆ نووسی، چونکە فاخر هێشتا ئەندامی حزب بوو، بەڵام لەق ببوو،کەهاتە لاشم وەك هاوڕێیەك و دۆستێك، دانی بەو کارەی خۆی ناو پاساویشی بۆ هەڵوێستەکەی خۆی دەهێنایەوەو بەرگری لە خۆی دەکرد».

لە راستیدا فاخر مێرگەسوری دژی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، بەڵام هەوڵی کوشتنی مام جەلال لە لایەن فاخرەوە ساغ نەبۆتەوە، تەنانەت کادیرو سەرکردەکانی ئەو ساکەی حزبی شیوعیش گوێیان لەو مەسەلەیە نەبووە... بەرێز مام جەلال لەو بارەیەوە دەڵێ*:«بەدووری نازانم مەلا مستەفا بە شێخ فاخری گوتبێ بۆ ئەوەی ئێمە بکوژێ، بەڵام من هیچ کەس، یان کەسێکم نەدیوە کە شەهید فاخر تەکلیفی کردبێت و بێت بۆ ئەوەی ئێمە بکوژێ، ئەو کاتە ئێمە زۆر شتمان دەزانی، زانیاری زۆرمان بۆ دەهات، زۆر هەوڵ دەدرا بۆ کوشتنی ئێمە، بەڵام من هەرگیز لەو هەوڵانەم نەبیستووە کە یەکێکیان ناردبێ ناوی (وەهاب کۆیی) بوبێ، بۆ ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدات، بەراستی من ئاگام لەو مەسەلەیە نی یە». ناکۆکیە فیکرییەکنە گرتنەوەی فاخر لەگەڵ هەڵوێستەکانی سەرکردایەتی حزبی شیوعی، مەسەلەکانی بەرەوناقاری ناکۆکیە شەخصیەکان برد، فاخر لەگەڵ بهاءالدین نوری دا هەڵی نەدەکرد، بەتایبەتی دوای شەڕی هەندرێن، بهاءالدین فاخری بەوە تاوانبار دەکرد کە بەلای بارزانی دا رویشتوەو پەیوەندی ژێراو ژێری لەگەڵدا دروست کردوە، هەروەها دوای شەڕی هەندرێن هەراو هوریاو مقۆمقۆی زۆریان لەسەر چەند پارچە چەکێك بۆ فاخر دروست کرد کە گوایا بەدیاری ناردبووی بۆ ئیدریس بارزانی، هەروەها موەلدەیەکی کارەبا کە دەستکەوتی شەڕی هەندرێن بوو فاخر بەدیاری بۆ ماڵی باوکی (حەمەد ئاغا) ناردبوو، ئەویش سەرئێشەی بۆ دروست کرد.

ماموستا بهاءالدین نوری ئەو قسانە رەت دەکاتەوە، کە ناکۆکی

---

• چاوپێکەوتنێکی تایبەت ٦/٤/١٩٩٧ـ سلێمانی

شه خصی له گه ڵ فاخردا هه بوو بێ، ده ڵێ هه رگیز هه ستم پێ نه کردووه، که ڕۆژێ له ڕۆژان رقی لێم بووبێ یان رقم لێ بوبێته وه،

هه روه ها ده ڵێ: «به پێچه وانه وه جگه له ڕێزو ئینسجام هه ستم به هیچ شتێ نه کردووه».

ئه م ناکۆکی و ململانێ یه، ئه گه ر مۆرکی فیکری، سیاسی، هه ڵوێست یان که سایه تیه کی به خۆوه گرتبێ، سه ره نجام بوه هۆی ئه وه ی فاخر له کاتی گفتوگۆی نێوان میری و شۆڕش دا له ساڵی ١٩٦٦ دا، واتا دوا به دوای شه ری هه ندرێن بۆ ماوه ی (٩) مانگ ته جمید بکرێ دوای ته جمیدکردنی ئیدی باره گای به جێ هێشت له کۆبونه وه یه کی فراواندا که له مزگه وتی به رسرین کرا، کادیرو پێشمه رگه کانی پرسیاری هۆی ته جمید کردنه که یان له بهاءالدین نوری پرسیبوو، به ڵام وه ڵامی نه دابوه وه گوتبوی خۆی بوێشتووه.*

پاش ئه وه ی ماوه ی ته جمید کردنه که ی فاخر کۆتایی هات، جارێکی دیکه گه ڕایه وه ناو حزب، به ڵام ناکۆکیه فیکریه کان قوڵتر بوبوون، فاخر زیاتر چوبووه ژێر باڵی (القيادة المركزية) و خۆی له گه ڵ سه رکردایه تی حزبی شیوعی به نامۆ ده زانی.

له کۆنفرانسی هه رێمی کوردستان دا دوای شه ڕی هه ندرێن، خۆی و ره ؤوف ـی حاجی قادر به ته مای ئه وه بوون که حزب به ره و چه پتر ببه ن، ته نانه ت له گه ل کۆمه کی کردن و گرێ دانی کۆبونه وه نهێنیه کان و په یوه ندی کردن له ته ك چه په کانی ناو شارو ئه ندامانی سه رکردایه تی هێڵی چه پ (فريق من كوادر الحزب) و (القيادة المركزية) دا به رده وام بوون، سه رکردایه تی حزب هه ستی به و جۆره نهێنی یانه کردبوو بۆیه مه ترسی یان له فاخر په یدا کردبوو بۆیه جارێکی دیکه ش له ساڵی ١٩٦٧، دوای ئیعلان کردنی جیابونه وه که ی (عزيز الحاج)، فاخر بۆ ماوه ی (٧) مانگی دی ته جمید کرایه وه.

به کوژرانی ره ؤوف ـی حاجی قادر له ١٩٦٧/٦/٢٠ دا، ئه ستێره ی سیاسی و عه سکه ری فاخر له ناو حزبدا کوژایه وه، چونکه ئه و خه ون و بۆچوون و پلانانه ی که له مێشکیاندا ده خولانه وه و سه رچاوه ی له بۆچوونه کانی (فريق من الكوادر) وه رده گرت بۆیه

---

*چاوپێکه وتنێکی تایبه ت له گه ڵ کمال شاکردا هاوینی ١٩٩٦

بە کوشتنی ئەو خەون و ئاواتەکانی زیندە بە چاڵ کران.
هەڵویستی فاخر رەنگە بە تەنها لایەنی سیاسی و فیکری نەبوبێ، بەڵکو ڕووی زاتیشی هەبووە، فاخر دوای ئەرەی ناوی دەرکرد هەستی بەوە دەکرد کەلیژنەی مەحەلی بۆ ئەوکەمە، وەبۆ سەرکەوتنی پلەکانی پەیژەی مەسئولیەت و گەورەبوون لە ناو حزبدا طموحی شەخصی لادروست بوو بوو، ئەو طموحەش هۆیەکی گرنگ بوو کە فاخری خستە ناو پەتی ململانێ و ناکۆکی...
(ابو حکمت) لە دانیشتنێکی تایبەتیدا تەئکیدی لەسەر ئەم بۆچوونەی ئێمە کرد.*
بەڵام شەوڵ و کۆشش و پیلان و تکتل کردن بەرامبەر بە سەرکردایەتی کلاسیکی حزب و سەرکەوتوو نەبوون، بە پێچەوانەوە ماوەی نێوان فاخرو ئەوانی زیاتر ناخۆش کرد، مۆرکو بۆیەیەکی زاتی و شەخصیشی بە ناکۆکی و ململانیەکە بەخشی، ئەوەبوو فاخر زیاتر لە حزب دوورکەوتەوە، بڕیاری (القیادة المرکزیة)ی حزبیش بە مانەوەی لەگەڵ بارزانیدا بێ ئەوەی حیساب بۆ ئاکامی ئەو بڕیارە بکەن، فاخری زیاتر بەرەو لای پارتی و بارزانی برد.
هیچ بەڵگەش لە بن دەستدا نین کە ئاماژە بۆ ئیستقالە کردنی فاخر بکەن لە حزبی شیوعیدا، بهاءالدین نوری-یش ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە فاخر بە ڕەسمی ئیستقالەی نەکرد بەڵکو خۆی لە حزب دوور خستەوە.
بۆیە نازانرێ کەی بە تەواوی لە حزب دابڕاو چووە لای بارزانی، یان نەء؟ دەشێ فاخر لە مانگی(١٠)ی ١٩٦٧ دا هیچ پەیوەندیەکی رەسمی بە حزبی شیوعی یەوە نەمابێ، ئەگەر چی ژمارەیەك لە کادیرەکانی (القیادة المرکزیة) دەڵێن فاخر تا کۆتایی ١٩٦٩ش پەیوەندی ناڕاستەوخۆی هەرمابوو زۆر جاریش جگە لەوەی کە ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاری و هەماهەنگی دەردەبڕی، لە ڕووی عەسکەریشەوە بیرۆکەی هونەری لە مەڕ تەقاندنەوەی مین و... تد کە تیایدا بالادەست بوو دەیدایە ئێمە، بەر لەوەی بیدا بە پارتی، بەڵام ئەم هەڵویستەی فاخر لە بەرامبەر هاوڕێیانی دوێنێیدا پاساو

* لە دانیشتنێکی تایبەتدا، هاوینی ١٩٩٦

بۆ هەلە سیاسیە کوشندەکەی ناهێنێتەوە، کەلە ئاکامدا بەتەواوی خۆی خستە باوەشی پارتی و بارزانی و لە راڕایی و سەکۆ گۆڕینی ناریەك حزب بازبداتە ناو حزبێکی ناکۆك و لەگەڵ بیرو بۆچونەکانی حزبێك کەسەرکردەکەی تا دوێنێ لەڕووی عەشایریی‌وفیکریشدا

دوژمنایەتی دەکرد.واز هێنانی سەنگەری فیکری (مارکسیزم ـ لینیزم) لەلایەن فاخرەوە ئەوە دەردەخا کەفاخر تووشی دڵەڕاوکێ بوەو لەناو گەرداوێکی ترسێنەردا خۆی بینیوەتەوە، لەئەنجامی ئەو زۆرانبازیەی کەلەناخیدا پەیدابوو بوو لەنێوان مانەوەی وەك مرۆڤێکی چەپرەو سەرکەوتن بەسەر پەیژەکانی بەناوبانگی دا لەڕێگای چوونەناو ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، ئەمەش سەرەتایێ کۆتایی هاتن بوو بەسەردەمی زێرینی فیکری و سیاسی فاخر کەماوەیەکی دوورو درێژ لەپێناویدا خەباتی کرد.

# لێپرسراوی لقی چوارو سەرەتای کۆتایی

دوای دەرچوونی بەیاننامەی (١١)ی ئازار، فاخر بوو بە لێپرسراوی لقی چوار لە سلێمانی و سەرپەرشتی لقی کەرکوکیشی دەکرد. ئەو لێپرسراوێتی یە بۆ (فاخر) کارێکی گران نەبوو، چونکە بەر لە دەرچوونی بە یاننامەی ئازار، ساڵێک زیاتر بوو لێپرسراوی عەسکەری و سیاسی شارەزوورو دۆڵی جافەتی و گەرمیان بوو، هەر لە بەر ئەوەش سەرکردایەتی (بارزانی) کردی بە لێپرسراوی لقی چوار.

یەکەم کار کە ئەنجامی دا، نەهێشتنی دوو بەرەکیەکەی نێوان باڵی بارزانی و باڵی تاڵەبانی بوو، چونکە خۆی پەیامبەری ئاشتی نێوانیان بوو، ئەو هەلوێستەی فاخر ئەندام و لایەنگرانی هێڵی تاڵەبانی بۆ لای خۆی راکێشا، هەروەها زۆر زووش لەگەڵ رووناکبیرانی شاری سلێمانی بەتایبەتی ئەدیب و نووسەراندا ئاشنایەتی پەیدا کرد.

لە فیستڤاڵی نۆزدەی حوزەیرانی ١٩٧٠، بۆ یادی پیرەمێردو یادی چوار ئەفسەرەکە کە (کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی) سازی کردبوو، لە بەغدا میوانێکی زۆر بە سەرۆکایەتی (جواهری) هاتبوون، فاخر زۆر چالاکانە سەرپەرشتی فیستڤاڵەکەی دەکرد، بۆنەیەکی باشیش بوو بۆ ناسینی ئەدیب و نووسەران، هەروەها پەیوەندیشی لەگەڵ شیوعیەکاندا باش بوو، ماوەیەکی کورت بەسەر کارەکەیدا تێنەپەڕیبوو کەنەیارەکانی کەوتنە دروستکردنی برو بیانوو کێشە بۆی.

دوای بەیانی ئازارو چوونی بۆ بەغدا خەڵکێکی زۆری لە بەعسیەگەورەکان ناسی لەوانە (سعدون غێدان)ی وەزیری ناوخۆ. بەعسیەکان دەیانزانی کە پەیوەندی فاخرو بارزانی باش نی یە و لە رووی فیکریشەوە جیاوازییان لەنێواندا هەیە، بۆیە حکومەتی بەغدا پێشنیازی ئەوەی کرد کە فاخر مێرگەسۆری بکرێت بە ئامر حەرەسی حدود، بەلام سەرکردایەتی بارزانی ئەو پێشنیازەی رەتکردەوە.

بەهێزبوونی کەسایەتی فاخر لەرووی سیاسی و عەسکەری یەوە، سەرکردایەتی بارزانی تووشی دڵەڕاوکێ کرد، بۆیە لەڕێگای چەند کەسانێکەوە کەوتنە دژایەتی کردنی فاخرو کێشەو سەرئێشە

دروست کردن بۆی، یەکێك لەوانە شفیق ئاغا بوو (شفیق لاین) ، کە کاتی خۆی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکان هەبووەو کە وتە سەنگەری دژایەتی کردنی فاخر، ئەوانەی کە لەو ململانێ یە ئاگادارن دەڵێن: شەفیق ئاغا بە فیتی ئینگلیزەکان ئەو کارەی دەکرد، بۆ تۆڵە سەندنەوە لە فاخر، چونکە لەساڵی ١٩٦٩ دا سەرپەرشتی لێدانی بیرەنەوتەکانی کرکوك ـ ی کردبوو ، شەفیق لاین پشتی بەوە بەهێزبوو کە لەلایەن بارزانی یەوە پشتگیری لێ دەکرا.

وەزۆر جار بەرەسمی لە بۆنەو ئاهەنگەکاندا نوێنەری بارزانی بوو.

هەروەها یەکێکی دیکە کە بۆ کێشە دروست کردن تەرخان کرا بوو و لەلایەن ئیدریس و مەسعود پشتگیری دەکرا بە رێوەبەری پۆلیس (کمالی شێخ غەریب بوو، کە فاخر لەکردەوەکانی ناڕازی بوو بەتایبەتی قسەی لەسەر بوو لەرووی بەرتیل خواردنەوە).

لەبۆنەیەکدا کمال شێخ غەریب پێش فاخر دەکەوێ، بۆ ئیستفزاز کردنی، دیارە فاخریش زۆر تورەدەبێ و قسە بەکمال دەڵێ ئەویش وەلامی دەداتەوە، ئەو رەفتارەی بەرێوەبەری پۆلیس و چەند کارێکی دیکە شی بوونە هۆی ئەوەی فاخر بڕیاری لادانی دەربکا، بەلام ئەو بڕیارە لەلایەن سەرکردایەتی بارزانی یەوە رەت کرایەوە، رەت کردنەوەی ئەم بڕیارە گورزێکی گەورە بوو بەر کەسایەتی و شوێنی فاخر کەوت، بەتایبەتی کە بارزانی بەدوای کمالی شێخ غەریبیدا نارد خەڵك وای چاوەڕوان دەکرد، دەری بکات بەلام بەخەلات کراوی گەڕایەوە. ئەگەر چی لەکۆنگرەی هەشتەمی پارتی دا فاخر مێرگەسوری بەئەندامی لیژنەی مەرکەزی هەڵبژێردرا، بەلام ئەوا رێگای لەدژایەتی کردنی فاخر نەگرت، بەپێچەوانەوە تا دەهات پەیوەندیەکانی بارزانی و فاخر تیرتر دەبوو.

لەسەردانی ئیدریس بارزانی بۆ سلێمانی، فاخر لە پێشوازی کردنی ئیدریس نەختێك دوا دەکەوێ، ئیدریس خۆی پێ نەگیراوەو دەڵێ: «فاخر وای لێ هات نەیەتە پێشوازی من»، هەر کە پێکەوەش دەچنە ناوچەی شارەزوور، خەڵکی لە پێشوازیاندا هاواریان کردووە «کاك فاخری مێرگەسوری میوانی شارەزووری»، هەروا لە ئاهەنگی نەورۆز لەحەساری نزیك کەرکوك لە ١٩٧٠/٣/٢٧، کە کوڕانی بارزانی ـ یش

ئاماده ی بوون، فاخر وه ك سونبلی ناوچه كه و سه ركرده ی بێ هاوتای كه ركوك و سلێمانی پێشوازی كراو مامه ڵه ی له گه ڵدا كرا.
دوای گه ڕانه وه ی ئیدریس بۆ باره گای بارزانی له ناوچه ی چۆمان واپێده چێ زۆر به ووردی به حساباتی خۆیان دا چوبنه وه، مه ترسی گه شه سه ندن و به هێزبونی شه خصیه تی فاخریان بۆ سه ر بنه ماله شی كردبێته وه.
فاخر مێرگه سوری، ئامانجی پارتی هێنانه دی، بارزانی به سوود وه رگرتن له كه سایه تی فاخر توانی خه ڵكی شاره زوور جافایه تی و گه رمیان و سلێمانی بۆ پارتی رابكێشێ، چونكه خه ڵكی ئه م ناوچانه فاخریان زۆر خۆش ده ویست، هه روه ها ده زگای پاراستن به ئاشكرا كه وته دژایه تی كردنی فاخر، ئه و ده زگایه ی كه مامۆستا بهاء الدين نوری له یادداشتنامه كه یدا ده ڵێ: «بیرۆكه ی دروست كردنی له لایه ن فاخره وه سه ری هه ڵداو دواتر له ده ستیان ده رهێنا».*
فاخر چونكه كوڕی حه مه د ئاغا بوو، له ڕووی كۆمه ڵایه تی و عه شایری یه وه خۆی له بنه ماڵه ی بارزانی به كه متر نه ده زانی، دوای ئه وه ی كه سایه تیه سیاسیه كه شی گه یشته ئه و ئاسته، دوور نی یه جۆره غرورێكی بۆ فاخر دروست كردبێ، ره نگه ئه و غروره ش هۆیه ك بێت له كۆتایی هاتنی ژیانی سیاسی فاخر، بۆیه دوای گه ڕانه وه ی ئیدریس بۆ ماوه یه كی كورت، به بڕوسكه یه كی تایبه تی مه لا مسته فا فاخر بانگ ده كرێته باره گای بارزانی و دواتریش بریاری لادانی فاخر له هه موو مه سئولیه تێك، له كۆبونه وه یه كی كۆمیته ی ناوه ندی پارتی یه وه ده رده چێ.
بڕیاری لادانی فاخر بۆ خه ڵكی روناكبیرو سیاسی كارێكی چاوه ڕوان كراو بوو، چونكه زۆربه ی ئه وانه ی كه فاخریان خۆش ده ویست له مه ترسی نزیك بوونه وه و تێكه ڵاوبوونی له گه ڵ بنه ماڵه ی بارزانی و بوونی به پارتی ئاگاداریان كردبوه وه، چاوه ڕوانی ئه و ڕۆژه و

* مامۆستا بهاء الدين نوری، ته نها كه سێكه كه باس له ڕۆڵی فاخر ده كا له دروستكردنی ده زگای پاراستنی پارتی. بڕوانه (مذكرات بهاء الدين نوري_ ط١_ ت٢_١٩٩٢ كردستان العراق.

ئه و بڕیاره یان ده کرد.

ته نانه ت حمه د ئاغای باوکیشی زۆر پێ ی ناخۆش بووه که فاخر وازی له حزبی شیوعی هێناو بوو به پارتی.

فاخر دوای کۆبوونه وه ی کۆمیته ی ناوه ندی پارتی و بڕیاری دوور خستنه وه ی گوتویه تی: «بڕیارێکی نابه وا بوو زوڵمتان لێ کردم».

ئه و بڕیاره بۆ کۆمه ڵانی خه ڵك، بڕیارێکی کت و پڕو چاوه ڕوان نه کراوبوو، بۆیه له سلێمانی یادداشتنامه یه کیان به ئیمزای (٦٥٠٠) که س بۆ بارزانی به رزکردبوه وه، داوای گه ڕانه وه ی فاخریان کردبوو، به ڵام به ر له وه ی یادداشته که بدرێته بارزانی نوێنه رانی خه ڵکه که که چونه لای فاخرو یادداشته که یان پیشان داوه ئه ویش گوتویه تی: پێویست ناکا، چونکه ئێستا شۆڕش و کورد له هه موو کاتێك زیاتر پێویستیان به یه کپارچه یی هه یه.

به مجۆره فاخر کۆتایی به ژیانی سیاسی خۆی هێناو دوای ئه وه ی وازی له حزبی شیوعی هێناو بووه پارتی، له ناو پارتیش وه ك جه سته یه کی نامۆ له لایه ن بارزانی یه وه ته ماشا ده کرا، بۆیه سه ره نجام له پارتیش دوور خرایه وه، فاخری په روه ده ی ناو بۆته ی سیاسی، سوك و ئاسان له سیاسه ت دوور خرایه وه، به شێوه ی مه لی باڵ براو له فڕین خرا.

# ئاشت بوونه وه ی بارزانی و تاله بانی

له کاتی گفتوگۆی نێوان حکومه تی به غدا و بارزانی دا، فاخر چه ند جارێك له گه ڵ وه فدی پارتی چوه ته به غدا، له وێ وه ك هه موو سه رکرده کانی تر، ژماره یه ك لێپرسراو و وه زیرو گه وره فه رمانبه رانی ده وڵه تی ناسیوه. له دوای ده رچوونی به یاننامه ی (١١)ی ئازاریش چوه ته لای مام جه لال له به غدا، یه که م جاربوو یه کتر ببینن و یه کتر بناسن. ئه وکات مام جه لال سه رکردایه تی باڵی مه کته بی سیاسی ده کرد که له ساڵی ١٩٦٤دا له بارزانی جیا بووه وه، ده رچوونی به یاننامه (١١)ی ئازار گۆڕانی به سه ر سه رجه م بزاڤی ڕزگاریخوازی گه لی کورد هێنا، کوردی له سه رده می شه ڕوشۆڕ و به گژدا چوونه وه دا له گه ڵ حکومه تی مه رکه زی گواسته وه بۆ سه رده می پێکه وه ژیان و به ڕێوه بردنی ئیداره ی هاوبه ش له کوردستاندا. بارزانی بۆ ئه وه ی ئه و که لێنه که که وتبووه جه سته ی کورده وه، نه هێڵێ و برینی چه ندین ساڵه ی لێك جیابوونه وه و لێك ترازان سارێژبکا، پێویست بوو به چاوێکی دیکه سه یری مه سه له کان و باڵی مه کته بی سیاسی بکات، زه مینه بۆ ئاشت بوونه وه و یه کبوونه وه ی ئیراده و بڕیاری کورد خۆش بکات، کورد ئه وکات پێویستی به یه کبوون هه بوو. بۆ ئه وه ی کارتی دووبه ره کی نانه وه له ده ست حکومه تی مه رکه زی ده ربێنێ. بۆیه هیچ ڕێگاچاره یه ك له به رده م سه رکردایه تی هه ردوولادا نه مابوو، جگه له ئاشت بوونه وه و یه کبوونه وه نه بێ.

بارزانی هه ردوای ده رچوونی به یاننامه ی ئازار، فاخری وه ك نوێنه ری شه خصی خۆی نارده لای مام جه لال بۆ گفتوگۆکردن له مه ر ئاشت بوونه وه و یه کبوونه وه. ده ست نیشان کردنی فاخر له لایه ن بارزانی یه وه بۆ ئه م کاره، هه ڵبژاردنێکی زیره کانه بوو، چونکه فاخر له ناو پارتیدا. له گه ڵ باڵی چه پ دا بوو، له هه مان کاتیشدا له لایه ن خه ڵکی سلێمانی و گه رمیان خۆشه ویست و ناسراو بوو.

راسته فاخر مێرگه سۆری ئه وکاته ی شیوعی بوو ودواتریش که بووه پارتی زۆر دژی باڵی مه کته بی سیاسی بو، له به ره کانی نێوان هه ردوولادا، هه میشه خۆی سه رکردایه تی شه ره کانی ده کرد، به لام له پرۆسه ی ئاشت بوونه وه دا رۆڵێکی کاریگه رو گرنگی بینی پێامبه ری

ئاشتی و ئاشت بوونه وه ی نێوان هه ردوولا بوو، مام جه لال به م شێوه یه باسی رۆڵی فاخر ده کا له ئاشت بوونه وه دا:*

«رۆڵی شه هید فاخر، رۆڵێکی سه ره کی بوو له ئاشت بوونه وه ی ئێمه و بارزانی، چونکه دوای به یاننامه ی ئازار که هاته به غدا، بۆ دیتنی من هاتبوو، راسپارده ی بارزانی پێ راگه یاندم بۆ ئه وه ی چاوم به مه لا مسته فا بکه وێ و ئێمه و ئه وان پێك بێینه وه، له گه ڵ یه کتر دانیشین و یه ك بگرینه وه».

«له دانیشتنی هه ردووکماندا لیم پرسی: بارزانی ئه و راسپارده ی به راسته یان ته کتیکه»؟؟

له وه لامدا وتی:«نه خێر به ڕاستیه تی، ئێستا بارزانی وا له وه زعه که گه یشتووه که کورد ئه مڕۆ له هه موو رۆژێکی تر پێویستی به یه کێتی ریزی رۆله کانی هه یه، بارزانی ده زانێ ئێوه هێزێکی کوردپه روه ری خوێنده وار و ده سه لاتدارن، له به ر ئه وه به پێویستی ده زانێ که پێك بێنه وه».

له وه لامی ئه و پرسیاره ی که چۆن باوه ری به فاخرو بارزانی کرد وتی:

«فاخر پیاوێکی ساغ بوو من باوه رم پێ بوو، زۆر هانی دام و ته شویقی کردم سوێندی گه وره شی بۆ خواردم که به راستیانه و هیچ فرت و فێڵی تێدا نی یه».

هه روه ها وتی:

«فاخر له باره ی یه کبوونه وه ی ئێمه و ئه واندا، ره ئیه کی دیکه ی هه بووه، ده یویست بزوتنه وه ی رزگاریخوازی خه ڵکی کوردستان له ئێران دوور بخه ینه وه.

ده یگووت: ئێمه و هه موو ئه و که سانه ی که پێشکه وتنخوازو چه پین، کورد په روه رین له ناو پارتیدا، له گه ڵ ئێوه یه ك ده گرینه وه، پارتی باش ده که ین و رێبازی کوردایه تیش ده گۆڕین له وه ی که گرێ دراوی رۆژئاوا و شابێت، بیته وه سه ر رێبازی شۆڕشگێرانه ی پێشکه وتنخواز، ئه وه ش یه كێك بوو له و هۆیانه ی که وای لێ کردم باوه ری پێ بکه م و بچینه وه لای بارزانی».

هه روه ها وتی:

«له بیرمه یه که م شه و که بارزانی-یمان دیت، مه لا مسته فاش هه مان

• چاوپێکه وتنێکی تایبه ت ١٩٩٧/٤/٦ سلێمانی

قسه ی کرد و گوتی: جه لال ئه گه ر ئێوه بێنه وه، ده بینه وه یه ك حزب، چونکه من پێشنیارم کرد به ره یه ك بکه ین به سه رۆکایه تی بارزانی، به لام ئه و وتی به ره بۆچی یه، به لێنت ده ده مێ که سالێکی پێ ناچێ پشتیوانیتان لێ ده که م و حزب ده ده مه وه ده ست ئێوه و ده قی قسه که ی وابوو: چۆن کاتی خۆی له به رامبه ر همزه و نه ژاد و ئه واندا پشتیوانم لێ کردن، به هه مان شێوه ش پشتیوانیتان لێ ده که م و حزب ده ده مه وه ده ست ئێوه، ئه وه ڕه ئی شه هید فاخریش بوو».

به م جۆره مام جه لال له گه ڵ فاخردا چووه لای بارزانی و پاش دانیشتن و گفتوگۆ ئاشت بوونه وه، بوونه وه یه ك حزب.

خوالێخۆشبوو عومه ر ده بابه ده رباره ی رۆڵی فاخر مێرگه سۆری له و ئاشت بوونه وه یه دا گوتوویه تی:«به راستی نه مده زانی ئه و فاخره ی که ئه وه نده دژی ئێمه بوو، به م جۆره رۆڵی خۆی ده بینێ له ئاشت بوونه وه ی ئێمه و بارزانی دا».

## (کوژرانی جه میل و جارێکی دیکه
## ته قینه وه ی ناکۆکیه کان)

جه میل کوڕی حمه د ئاغای مێرگه سوری بوو، ئه ندامی حزبی شیوعی عێراقی بوو، به پێچه وانه ی فاخری برایه وه، ئه و نه بووه پارتی و وازی له حزبی شوعی نه هێنا.

گه نجێکی ئازاو سه رکێش و سه رچڵ بوو، نێوانی له گه ڵ کوره کانی شێخی بارزان باش نه بوو، حمه د ئاغای باوکی و فاخری برایشی زۆرله ره فتارو هه لسوکه وتی رازی نه بوون.

دوای به یانامه ی ئازار هاته هه ولێرو خه ریکی که سابه ت بوو، زۆر جار باوك و براکه ی هه ولیان له گه لدا بگه رێته وه، که چی به گوێ ی نه کردن و هه ر له هه ولێر مایه وه.

حزبی شیوعی عێراقیش تێ بینی له سه ر هه بوو، گله ییان لێ

دەکردو رەخنەیان لێ دەگرت، بەڵام زۆر ڕوون نی یە کە گلەیی و رەخنەکانیان لەچ بارێکەوە بوو. لە(١٩٧٠ـ١٩٧١)، ژمارەیەکی زۆر لەجولەکەکانی عێراق دەیانویست لەرێگای ئێرانەوە بچنە ئیسرائیل.

ئیدریس بارزانی لەرێگای فەرەنسۆ حەریری یەوە، باندێکی بۆ ئەم مەبەستە پێکهێنا بۆ ئەوەی جولەکەکان بەپارەیەکی زۆر دەرباز بکەن.

کەچی رەئێکی تر هەیە دەڵێ ئەو باندە لەلایەن شێخ محەمەد خالد بارزانی یەوە سەرپەرشتی دەکرا.

جەمیل ئەم هەواڵەو جموجۆڵی باندەکەی گەیاندە حزبی شیوعی، دواتریش حکومەتی مەرکەزی بەو باندەی زانی.

کەچی رەئێکی دیکە هەیە دەڵێ: جەمیل خۆی یەکێک بووە لەئەندامانی ئەو باندە، ئەڵقەی پەیوەندیش بووە لەنێوان جولەکەکان و سەرۆکی باندەکە، دوور نی یە ئەو رەئیەش راست بێت بەتایبەتی لەکەسایەتی وەهەڵسوکەوتی جەمیل دەوەشایەوە، ئەگەر چی هیچ کاتێك پەیوەندی ئەو کوڕەکانی شێخەکانی بارزان، وانە بووە کەبوار بۆ ئەنجامدانی کارێکی وابرەخسێنێ، بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت هەواڵی ئەو باندە لەلایەن جەمیلـ وە ئاشکرا کراوە.

تێوەگلانی ناوی ئیدریس بارزانی لەو باندەدا، ریسواییەکی گەورەبوو، بەتایبەتی پەیوەندی نێوان حکومەتی مەرکەزی و سەر-
-کردایەتی شۆڕش لەوپەڕی گەرم و گوڕی دا بوو.

بۆ بزرکردنی نهێنی و سەرەداوی ئەو باندە، پاراستن پیلانی بۆ تیرۆرکردنی جەمیل دارشت، بەوهیوایەی ئاسەواری ئەو ریسواییە لەسەر ئیدریس رەش بکاتەوە.

سەرەتا پاراستن ویستی لەرێگای لقی هەولێری پارتی یەوە بیگرێ و ئینجا بڕیاری پلانەکە جێ بەجێ بکات، بەڵام وا پێدەچێ جەمیل نەچوبێتە ژێر باری گەف و هەڕەشەی پارتی ونەچوە بۆ لقی (٢) بۆیە پلانەکەیان گۆڕی و پیلانی تیرۆرکردنی راستەوخۆیان دارشت. جێ بەجێ کردنەکەشیان خستە لێپرساوێتی (حەمەرەؤوف) ناوێك کەئەندامی حزبی شیوعی و هاوڕێی نزیکی جەمیل بوو.

رۆژی ١٤/٢/١٩٧١ لەنزیك قوتابخانەی زەینەب ـی ئێستا،

لەهەولێر، جێبێکی پڕ چەکدار بەبەشداری حەمە رەئووف تەقەیان لەجەمیل کردو کوشتیان.

هەواڵی کوژرانی جەمیلی حمەد ئاغا لەرۆژنامەکانی ئەو کاتەی بەغدادا بڵاوبوەوە، (التآخي) کەپارتی دەری دەکرد لەشێوازی دارشتنی هەواڵەکەو ویستبووی هەواڵی کوشتنی جەمیل بێ بایەخ لەقەڵەم بداو دوای دووهەفتە هەواڵەکەی لەلاپەرەی الوفیات دا بڵاو کردەوە، بۆئەوەی تەمێك بخاتە سەر رووداوەکە .

فاخر یەکسەر دەگاتە هەولێرو تەرمی براکەی دەنرێتەوە مێرگەسور، بەڵام خۆی هەر لەهەولێر دەمێنێتەوە، تا هەموو سەرەداوی کارە تیرۆریستەکە ئاشکرا دەکات و شوفێری جێبەکە ئیعتراف لەسەر (حەمە رەئووف) دەکا کە بۆ پاراستن ئیشی کردووەو بەفەرمانی ئەوانیش ئەو کارەی ئەنجام داوە.

لەپرسەکەدا فاخر بەئیدریسی گوتبوو: ئێوە خوا کردوونی بەگەورەی ئەو میللەتە، ئەگینا ئەوەنین بتوانن لەئێمە بکوژن.

هەروەها حەمەد ئاغا بەمەلا مستەفای گوتبوو: ئەگەر کورەکەی من جاسوس بوایە بەمنت بگوتایە، ئەگەر نەمکوشتایە هەقت بوو، بەڵام جەنازەکەی بێ ناز لەکۆڵانەکانی هەولێر بکەوێ، خەڵك دەڵێ خاڵۆزای مەلا مستەفا کوژراوە.

مەلا مستەفای بارزانی لەدیدارێکدا لەگەڵ حمەد ئاغاو فاخر بەئامادە بوونی سلێمان بەگی دەرگەڵە گوتوویەتی: ئێمە دەستمان لەکوژرانی جەمیل دا نی یە، هەڵبەتە پاراستن پەیوەندی بەکورەکانیەوە هەبووە نەك بەخۆیەوە، لەپرسەی جەمیل دا لەمێرگەسۆر، هەموو شێراوانیەکان بریاریان دابوو لەبەرامبەر ئەو کارە ئیهانەت ئامێزەی بنەماڵەی بارزانی دەستە وەستان نەوەستن و دەست بەجێ لەوێ تۆڵە بکەنەوە، نەك تەنها لەبکوژی جەمیل، بەڵکو لەوانەی کەبریاری کوشتنیان دەرکردبوو، بەڵام فاخر زۆر هەوڵی دا کێشەکە کۆتایی پێ بهێنێ. لق و پۆپی لێ نەبێتەوە، ئامۆژگاری براکانی کردبوو کەواز لەتۆڵە سەندنەوە بێنن، چونکە وەزعی کورد ئەوەندە هەڵناگرێ کەکێشەی لاوەکی لێ ببێتەوە، بەڵام کوژرانی جەمیل وەك بۆمبایەکی تەوقیت کراو بوو، ئەگەر

جه میل ـ یش نه ته قیبایه وه به شێوازێکی ترو له بۆنه یه کی دیکه‌دا هه ر ده ته قیه وه.

## ( کوشتنی حه مه ره ؤوفاو گرتنی حمه د ئاغاو فاخر )

هه وڵه کانی فاخر بۆ تۆڵه نه سه ندنه وه سه ری نه گرت، براکانی جه میل به تایبه تی سه عید ئۆقره ی لێ برا بوو، به ئاشکرا گوتبووی تابکوژی براکه م نه کوژمه وه راناوه ستم...

حه مه ره ؤوف دوای کوژرانی جه میل، وه کو شۆفێر له نێوان هێلی (خه تی) گه لاڵه و هه ولێر له سه ر کاری شۆفێری به رده وام بوو چونکه هه ستی نه ده کرد که ماڵی حمه د ئاغا زانیویانه ئه و بکوژی جه میل ـ ه، سه عیدیش له ده رفه تێکدا ده گه ڕا بۆ ئه وه ی حمه ره ؤوف بکوژێته وه.

رۆژێك حمه ره ؤوف له گه ڵ کوره پورێکی به لۆریه ك له گه لاڵه وه ده گه ڕێته وه هه ولێر (سه عید) له نزیك به رده سپی نێوان گه لاڵه و به رسرین رێگای لێ ده گرێ و ره ؤوف دێنێته خواره وه و یه کسه ر ده یکوژێ، ته رمه که ی ره ؤوف ده به نه وه گه لاڵه... کوژرانی هه لایه کی گه وره ده قه ومێنێ، قین و رقی مه لا مسته فا هه لده سێنێ، چونکه له لایه ك پیاوێکی ئه ویان کوشتوه، له لایه کی دیکه ش له بن هه نگڵی ئه ودا ته حدایان له یاساو حوکمی ئه و کردوه.

به ر له وه ی ته رمه که ببه نه وه هه ولێر... مه لا مسته فاو کوره کانی پێشوازیان له ماڵی حه مه ره ؤوف کردو، دڵیان دانه وه و ، به ڵێنیان پێ دان، که به زووترین کات بکوژی (ره ؤوف) له به ر چاوی خه ڵك ئیعدام بکه ن، ته نانه ت بارزانی پێیانی گوتبوو:«ئه و گولله ی به ره ؤوف که وتوه به من که وتوه».

هه ر که سه عید به هه ڕه شه که ی بارزانی زانیبوو. خۆی و خه لۆ برادۆستی، ناوچه ی باڵه ك به جێ دێڵن و ده چنه بارزان. ئه و کاته شێخ عوسمانی کوری شێخ ئه حمه دی بارزانی له گه ڵ مه لا مسته فا له سه ر شێخایه تی و گه وره یی بنه ماڵه مشت و مڕیان بوو.

مه لا مسته فا له گه ڵ شێخ محه مه د خالدی کوری شێخ ئه حمه دی بارزانی له دژی شێخ عوسمان یه کیان گرتبوه وه.

پەنا بردنە بەر شێخی بارزان و چونە سەر گۆڕی خودان نەریتێکی عەشایری بارزانیەکان بوو، هەر کەسێك پەنای بردبایە بەر شێخی بارزان و چوبایە سەر گۆڕی خودان (شێخ ئەحمەدی بارزانی)، ئیتر جۆرە حەصانەتێکی دژ بەکوشتن مسۆگەر دەکرد، لەراستیدا سەعید توانی بۆماوەیەکی کورت ئەو جۆرە حەصانەتە بەدەست بهێنێ بەلام لەسەر حیسابی گرتن و دەست بەسەرکردنی حەمەد ئاغای باوکی و فاخری برای بوو.

مەلا مستەفای بارزانی، حمەد ئاغاو فاخر کەئەو کات ماڵیان لەچۆمان بوو گرتنی و دوای چەند ڕۆژێك حەمەد ئاغای ئازاد کرد، چونکە پەککەوتەو نەخۆش بوو، دوای مانگێك فاخریشی ئازاد کرد.
شیاوی گوتنە کەسلێمان بەگی دەرگەلەیش لەگەڵ ئەواندا گیراو دەست بەسەر بوو.
ئازاد کردنی حەمەد ئاغاو فاخری کوڕی کارێکی تەکتیکی مەلا مستەفا بوو، دیسانەوە ئەو ترسەی کەبەرامبەر ماڵی حەمەد ئاغا هەیان بوو، کەتەنها بنەماڵە بوو توانای ململانێ ی لەگەڵ بارزانی هەبوو و بەتەواوی نەدەکەوتنە ژێر رکێفی ئەوان و خۆیان بەسەرۆکی (شێروانی)، کەگەورەترین عەشیرەتی ناوچەکە بوو لەقەڵەم دەدا، بەکوژرانی جەمیل و حمەرەئوف ناکۆکی و ململانێ ی نێوان هەردوولا زیندوبوەوە، فاخریش کەبەتەواوی ببوە پارتی و گەیشتە پلەی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی، مەلا مستەفاو کوڕەکانی بەدوو چاو تەماشایان دەکرد، چاوی بەکارهێنانی بۆجێ بەجێ کردنی مەرامەکانیان کەدیارە لەم بوارەدا زۆر زیرەکانە کەسایەتی سایکۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتی فاخریان ناسیبوو، توانیان لەزۆر بواردا سوودی لێ وەربگرن و لەبەرەکانی شەڕو لەکارەکانی ڕێکخستندا بیکەنە سەرەنێزەی خۆیان، هەروەها بەچاوی ترس و دڵەراوکێ و دوژمنی دوێنێیش تەماشیان دەکرد، چونکە فاخر لەبەر ئاستی سیاسی و عەسکەری و ڕۆشنبیری و عەشایری تاکەکەسێك بوو کەڕۆژێ لەڕۆژان بتوانێ ڕۆڵی ڕێبەرایەتی لەناوچەکەی خۆیاندا ببینێ و ببێتە ڕکەبەری بەرانبەر مەلا مستەفا بۆیە ئازاد کردنیان تەکتیکێکی کاتی بوو، بۆ گەڕانەوەی متمانەو وەهاشی نیشان بدەن کەکوژرانی (حمەرەئوف)ێکی بێگانە، لەوە کەمترە

که له گه ڵ ماڵی حه مه د ئاغادا بیکه نه ناخۆشی و دوژمنایه تی و تێکی بده ن، که چی له هه مان کاتدا له ژێره وه خه ریکی پیلان داڕشتن بوون بۆ گرتنی هه موو کوڕه کانی حه مه د ئاغاو گواستنه وه یان بۆ زیندانێکی نزیك خۆیان، بۆ ئه وه ی به ته واوی ئه و ترس و دڵه راوکێیه نه هێڵن و ئه فسانه ی کوڕانی حمه د ئاغا کۆتایی پێ بهێنن و گۆڕه پان بۆ خۆیان ته خت بکه ن.

زۆربه ی کوڕه کانی حه مه د ئاغا له مێرگه سور بوون، پیلانی گرتنیان به وه ده ستی پێ کرد که دوای کوژرانی حه مه ره ؤوف شێخ مه حه مه د خالد بڕیارێکی ده رکرد که که س بۆی نی یه به چه که وه بچێته دیوه خانه که ی، له مانگی نیسانی ۱۹۷۲دا هه موو کوڕه کانی حمه د ئاغا ئه وانه ی له وێ بوون (ره شید، سه عید، ئه سعه د، مه جید) له گه ڵ خه لیل. سلطان ـ ی برازای و سوار ئاغای شێروانی و له گه ڵ هه ندێك له خزمه کانیان له لایه ن شێخ مه حمه د خالده وه ده عوه ت کران.

شێخ مه حه مه د خالد پێ ی گوتبوون: «من بۆیه بانگی ئێوه م کردووه تا هه موومان پێکه وه بچینه لای مه لا مسته فا بۆ نه هێشتنی ئه و ناخۆشی و عاجزیه ی له نێواندا هه یه، چونکه ناکرێ ئه و کێشه یه له نێوان ئێمه و ئێوه دا که خاڵو خاڵۆزاین هه روا بمێنێته وه، له وێ حمه د ئاغاو-فاخریش بانگ ده که ین، هه موومان پێکه وه داده نیشین، بۆ ئه وه ی ناخۆشیه که له وه وزیاتر ته شه نه نه کات چونکه ئه گه ر ناخۆشی له نێوانماندا بمێنێ هه موو لایه کمان زه ره رمه ند ده بین هێشتا هه ر خه ریکی قسه کردن بوون، که هێزێکی زۆری بارزانیه کان به سه ر په ره شتی (حه لکه ی دۆله مه رێ) که مه لا مسته فا ناردبووی له گه ڵ هێزه که ی شێخ محه مه د خالد ده وری دیوه خانه یان گرت.

شێخ محه مه د خالد به ره شیدی کوڕی حمه د ئاغای گوتبوو: «ئێوه له گه ڵ (حه لکه) ده ڕون و پاشان منیش دێم».

به مجۆره شێخ حه مه د خالد سیناریۆی پیلانه که ی بۆ مه لا مسته فا جێ به جێ کردو ئه وانه ی که بۆ ده عوه ت بانگ کرابوون، به ده ست به سه ری ره وانه ی به ندیخانه ی رایات کران.

شیاوی گوتنه خه ڵۆ برادۆستی که له گه ڵ سه عید له کوشتنی حه مه ره ؤوف دا به شدار بوو له ده ره وه ی دیوه خانه به چه که وه وه ستابوو

ئه ریشیان گرت و چه کیان کردو له گه ڵ ئه واندا راپێچی زیندانیان کرد له هه مان کاتیشدا بۆ جارێکی دیکه حه مه د ئاغاو فاخرو جه وهه ریش که ماڵیان له ناوچه ی باڵه ك بوو گیرانه وه و ره وانه ی زیندانی خه لان کران، سه عیدی بکوژی حمه ره ؤوف جیاده که نه وه و ره وانه ی به ندیخانه ی خه لان ـ ی ده که ن که باوکی و هه ردوو براکه ی و فاخرو جه وهه ریش له وێ بوون.

ئه ڵقه ی سناریۆیه که به وه کۆتایی هات که پاش ماوه یه کی تر چه ند خزمێکی تری حه مه د ئاغایان گرت و ره وانه ی به ندیخانه یان کردن.

تا مانگی ته مموزی ١٩٧٢، ماڵ و منداڵی به ندکراوه کان ده چوونه لای پیاوه کانیان، به ڵام دواتر (فاخرو سه عیدو خه لۆ برادۆستی) بێ سه رو شوێن کران و هه ر له مانگی ته مموزی ١٩٧٢ ـ ه وه تاکو ئه مرۆشی له گه ڵدا بێت هیچ زانیاریه ك ده رباره ی ئه و سێ که سه نی یه و نازانرێ چۆن شوێن بزرکراون و چۆن له ناوبراون؟.

حه مه د ئاغاو جه وهه ری کوڕی له ١٩٧٣ وه تاکو ساڵی ١٩٧٥ له خه لان بوون، ئه گه ر چی ده ست به سه ر بوون، وه ك جه وهه ر له یادداشته کانی دا ئاماژه ی بۆ ده کا ده یتوانی رابکا، به ڵام ئه و کاره یان نه کرد.

حه مه د ئاغاو کوره کانی تری دوای ئاش به تاڵی شۆرش له ئازاری ١٩٧٥ دا له ڕۆژی ٢٢\٢٣/٣/١٩٧٥ قه تلو عام کران و له ڕۆژی ٢/ نیسانی/١٩٧٥ دا ته رمه کانیان دۆزرانه وه.

---

* له راستیدا سه عیدو خه لۆ برادۆستی، هه ردوای گرتنیان له مێرگه سۆر، که س چاوی پێ نه که وتنه وه و دوای ته مموزی ١٩٧٢ش ، هیچ هه واڵێکیان نه ما.

## سه ره تا

چیای هه ندرین یه کێکه له چیا، هه ره به رزو گه وره کانی کوردستانی عێراق، کۆنترۆڵی به سه ر ناوچه یه کی فراواندا هه یه، ناوچه ی سۆران و باڵه کایه تی و دۆڵی خانه قاو دۆڵی ئاکۆیان به یه ك ده به ستێته وه، تابڵی ی چیایه کی سه خت و پڕده وه نه و دارستانی چڕو پڕی تێدایه، ره نگه به سه دان دۆڵی تێدا بێ، به لام به راورد له گه ڵ چیاکانی تردا، زۆر وشك و برینگه، به تایبه تی دامێن و ناوه راسته که ی، له به ر ئه وه ی له شورشی ئه یلول دا، چه قی شۆرش و پایته ختی مه لا مسته فای بارزان له ناوچه ی باڵه کایه تی بوو، چیای هه ندرین پارسه نگ و ته رازووی هێز بوو له نێوان هێزه کانی شۆرش و هێزه کانی حکومه تی عێراقه وه، چونکه گرتن و وه ده رنانی هێزی پێشمه رگه له چیای هه ندرین دا، به مانای دروست کردنی مه ترسی بوو له سه ر باره گاکانی بارزانی و باره گاکانی حزبی شیوعی عێراق که له ژێر سێبه ری چیاکه دا بوون.

بۆیه حکومه تی عێراق هه ر له سالی ١٩٦٥ـه وه، مرخی خۆی له و چیایه خۆش کردبوو، له هه ر ده رفه ت و بۆنه یه ك ده گه را بۆ ئه وه ی له ته ك چیای زۆزك له گه ڵ چیای کۆره ك دا،که به درێژایی شۆرشی ئه یلول و شۆرشی نوێ ی گه له که مان له ژێر ده ستی هێزه کانی حکومه ت دا بوو،، سێ کۆچکه یه کی سروشتی ــ سه ربازی دروست بکات و کۆنترۆڵ به سه ر هه موو ناوچه که دا بکا، (سۆران و باڵه کایه تی و دۆڵی خانه قا ) به هۆی هه ندرینـه وه، (برادۆست و مێرگه سۆرو بارزان) له رێگای زۆزك و دوڵی ئالانه و دۆڵی بله و خه لیفان به هۆی کۆره کـه وه، که له هه مان کاتدا به زه قی ده روانێته حه وزی رواندزو شاده ماری رێگای هاملتون. گرتنی هه ندرین بۆ حکومه تی عێراق، به سه رکه وتنێکی سه ربازی و سیاسی گه وره له قه له م ده درا، چونکه له روێکه وه باره گاکانی بارزانی پێ له ق ده بوو و ده که وتنه ژێر ره حمه تی گولله و تۆپ بارانی ئاسانی هێزه کانی حکومه ت و ماوه ی نێوان حکومه ت و سه رکردایه تی شۆرشی بۆ هه ر گفتوگۆیه کی تر

دورتر ده کرده وه و داخوازیه کانیشی که متر ده بونه وه.
ره نگه بۆ چاندنی تۆی ی دووبه ره کیش له نێوان پارتی و حزبی شیوعیدا ده رفه تێکی باش بوو بێت، هه روه کو له دوای گرتنیشدا ده رکه وت، که چۆن په یوه ندی حزبی شیوعی و سەرکردایه تی بارزانی تووشی حاڵه تێکی ته ماوی بوو.
گه وره یی شه ری هه ندرێن هه ر له وه دا نه بوو، که وای له حکومه تی مه رکه زی کرد، ده ستی گفتوگۆ بو سه رکردایه تی شۆرش درێژ بکات، به ڵکو زیندی له دایك بوون و گه شه سه ندن و په ره سه ندنی توانا و ئیمکانیه تی چه ندین سه رکرده ی ئه یندانی بوو، که دواتر رۆڵی گه وره و کاریگه ریان گێرا له ناو بزافی رزگاریخوازی گه لی کوردا.
شه ری هه ندرێن زۆری له سه ر نوسراوه، هه ر وه ك چۆن زۆر لایه نی تاریکی رووناك کراوه ته وه، زۆر لایه نیشی به تاریکی ماوه ته وه تاکو ئێستا به وردی له سه ری نه نوسراوه.
رۆڵی حزبی شیوعی به شێوه یه کی گشتی و سه رکرده و کادیرو عه سکه ریه کانی به شێوه یه کی تایبه تی مافی خۆی نه دراوه تێ پێویسته حزبی شیوعی جارێکی دیکه مێژووی شه ری هه ندرێن بنوسێته وه، بۆ ئه وه ی ئه و لایه نه تاریك و هه ڵه مێژووییانه راست بکرێنه وه.
ره نگه له هه موو که سێك که زیاتر مافی خورا بێت و باسی رۆڵی وه ك پێویست نه کرابێ، ناو ناتۆریشی بۆ دروست کرابێ، فاخر مێرگه سۆری بێ،چونکه فاخر وه ك سه رکرده ی راسته وخۆی هێرشه کان و دارشتنی پلانی شه ره که له گه ڵ هاوری کانیدا رۆڵی سه ره کی هه بوو.
هه ر ئه و رۆله ش بوو، فاخری زیاتر وه ك سه رکرده یه کی عه سکه ری بوێرو دڵسۆز بۆ شۆرش ناساندو ته نانه ت رۆژنامه ی (طریق الشعب) له دوو ژماره ی یه ك له دوای یه کدا دوای شه ره که ، فاخری به پاڵه وانی شه ری هه ندرێن له قه ڵه م داو کردی به سومبلی ئازایه تی و نمونه ی پێشمه رگه ی شیوعی.

## چۆن حکومەتی عیراق چیای هەندرێنی گرت؟

پێش شەری هەندرێن، هاتوچۆ لە نێوان حکومەت و سەرکردایەتی شۆرش دا هەبوو، حکومەتی عیراق خەڵکی دەناردە لای بارزانی بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکات، یەکێك لەو وەفدانەی کە هاتنە ناوچەی بالەك لە (اکرم حامد الجاف، عەقید مجید ملا علی، زید احمد عثمان المحامی، شفیق احمد «ناسراو بە شفیق لاین» واحمد کمال قادر) پێك هاتبوو.

سەرەتا بە بریاری بارزانی، پێشمەرگە و کادیرەکانی حزبی شیوعی تەنها پێشوازیان لێ کردن، بەلام بۆیان نەبوو باسی هیچ شتێکیان لەگەڵدا بکەن، دواتر ئاشکرا بوو کەوەفدەکە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بارزانی دا هاتوون، چونکە عبدالسلام و عبداللطیف الدراجی زۆر نەبوو بەکەوتنە خوارەوەی فرۆکە کوژرابوون و عبدالرحمن عارف ببوو بەسەرۆکی عیراق.

وەکو حاڵەتێکیش کە ئەو کاتە باوبوو، هەر کەحکومەتێك دەگۆرا دەرگای گفتوگۆی لەبەردەم شۆرشدا دەکردەوە، لەو روانگەشەوە حکومەتی عبدالرحمن دەستی گفتوگۆی بۆ شۆرش درێژ کردوو ئەو وەفدانەی دەناردە لای بارزانی.

وەفدەکە سێ رۆژ لای مەلا مستەفای بارزانی مایەوە، پێشمەرگەکانی هەندرێن بەشی زۆری بۆ پشوودان هاتبونە خوارەوە، سوودیان لەو دەرفەتە وەرگرت کەوەفدی حکومەت خەریکی گفتوگۆیە، تەنها (١٢) پێشمەرگە بە سەرکردایەتی مام صدیق کاولۆکی لە سەنگەرەکان مابونەوە، ئەو ژمارە کەمە بۆ چیایەکی گەورە و سەختی وەك هەندرێن و لەبەرامبەر پلانێکی ژێراو ژێری حکومەت دا، لەرووی هێزو مەعنەویاتەوە، هەرگیز بەراورد ناکرێ.

لەهەمان کاتیشدا (ملازم ریاض) کە ئەفسەرێکی عەرەب و کادیرێکی سەربازی حزبی شیوعی بوو لە ١٩٦٦/٥/١ دا ژنی دەهێنا، زۆربەی کادیرە عەسکەری وپێشمەرگە شیوعیەکان، کە مەسئولیەتی پاراستنی چیای هەندرێن ـ یان لەئەستۆدا بوو، هاتبونە خوارەوە بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەی هاورێکەیان. چونکە پشتیان بەوە قایم بوو، کە بارزانی لە حاڵەتی گفتوگۆدایە لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی دا.

لیوای چواری سه ر به فرقه ی(٢)، که ئه وکات له رواندز بوو له گه ڵ جاشه کان، ئه و ده رفه ته یان به هه ل زانی بۆ ئه وه ی له ژێر په رده ی گفتوگۆدا، پلانی گرتنی هه ندرێن جێ به جێ بکه ن.
له به ره به یانی ١٩٦٦/٥/٣\٢ دا، هێرشی حکومه ت ده ستی پێ کردوو تاسه عات چواری ئێواره، زۆربه ی چیای هه ندرێن گیرا، ته نها (که پکه موو) نه بێ که ئه و کاته نه که وته به ر ده ستی هێزه کانی حکومه ت. گرتنی هه ندرێن له لایه ن هێزه کانی حکومه ت، گورزێکی کوشنده بوو له حزبی شیوعی به تایبه تی و شۆرش به شێوه یه کی گشتی که وت.. ده رفه تێکی باشیش بوو، بۆ کوڵاندنه وه ی برینی کۆنی ناکۆکی نێوان بارزانی و فاخر مێرگه سوری، بۆیه پارتی حزبی شیوعی به وه تاوانبار کرد که له کاتی هاتنی وه فدی حکومه ت بۆ باڵه ك ژێر به ژێر له گه ڵیان دا رێککه وتون و چیای هه ندرێن-یان پێ فرۆشتوون، له هه مان کاتدا فاخریان به وه تاوانبار کرد، که هه ندرێنی به «ده هه زار» دینارو چه ند پارچه چه کێك فرۆشتوه. ئه و قسانه مقۆ مقۆی زۆر لای شیوعیه کان دروست کردوو له نێو خۆشیاندا هه وڵی ئه وه یان دا که ئه و لاسه نگیه راست بکه نه وه. گرتنی هه ندرێن سه رکردایه تی شۆرشی تووشی ره ش بینی کرد، ته نانه ت ئیدریس بارزانی که ئه و کاته که سی دووه می شۆرش بوو، له سه ردانێکی دا بۆ ناو شیوعیه کان له ناوچه ی به رسرین دا، به کۆمه ڵێك کادیری شیوعی گوتبوو: «بۆ واتان کردوو.. هه ندرێن-تان فرۆشت»و له وباوه ره شدا بوو که ئیتر هێز نی یه بتوانێ چیاکه رزگار بکاته وه، پاش خۆ قایم کردنی هێزه کانی حکومه ت له سه نگه ره نوێ یه کانیاندا. به ڵام سه رکرده سه ربازیه کانی ئه و ساکه ی حزبی شیوعی، له گه ڵیشیاندا فاخر مێرگه سوری، به ڵێنیان دابوو، له ده رفه تێکی نزیکدا هه موو هه ندرێن ئازاد بکه نه وه. ده رۆژ .. هێزه کانی حکومه ت سه نگه ر به ندیان ده کردو شوێنه کانیان قایم ده کرد، له به رامبه ردا حزبی شیوعی خۆی ته یار ده کرد بۆ ئه وه ی دژه هێرش بکات و هێزه کانی حکومه ت وه ده ربنێن .

## «خۆ ئاماده کردن»

رزگارکردنی چیای هه ندرێن کارێکی ئاسان نه بوو، نه ك ته نها له رووی لۆجیستی، به ڵکو له رووی ده رونیشه وه، بۆیه پێویست بوو

بـه ر لـه هـه ر دژه هێـرشێـك دا، زه مینـه بـۆ ئـه وه خـۆش بکـرێ که له به رامبه ر ئه و شکسته گه وره دا، سه رکه وتنێکی گه وره به ده ست بهێنرێ.

جاشه زێباریه کان و رێکانیه کان پێشره ولی هێزه کانی حکومه ت بوون له چیای هه ندرێن، زێباریه کانیش به شه ر که روو، ئازاو چاونه ترس ناسراون.

بۆ هێزی پێشمه رگه به تایبه تی ئه و سه رکردایه تیه مه یدانیه ی که بۆ چۆنیه تی پلان دارشتن و رزگارکردنی چیای هه ندرێن له لایه ن حزبی شیوعیه وه پێك هاتبوو، مانه وه ی جاشه زێباریه کان له سه نگه ره کانی پێشه وه ی چیای هه ندرێن، به ربه ستێکی ئاسان نه بوو، ره نگه بۆ رووبه روو بونه وه ش ئاسته نگی زۆریان دروست ده کرد، بۆیه سه رکردایه تی مه یدانی بۆ رزگارکردنی شه ری هه ندرێن، داوای له بارزانی کرد له رێگای «فارس باوه» وه که ئه وساکه ئامر هێزی ده شتی هه ولێر بوو، گورز له خاو خێزانی ئه و زێباری و رێکانیانه بوه شێنی، بۆ ئه وه ی به ره کانیان به جێ بێلن و بگه رێنه وه ناو مالْ و مندالْی خۆیان.به راستیش ئه و پلانه سه ری گرت، (فارس باوه) بریاری مه لا مسته فای جی به جێ کرد، مالْ و منالْی زێباریه کان گوشاریان بۆ پیاوه شه ر که ره کانیان هێناو ئه وانیش بۆ به ریرسه گه وره کانیان .
دوای (٤٨) سه عات لـه لێدانـی مـالْ و منـدالْی جـاشـه زێبـاریـه کـان، سه نگه ره کانیان ته سلیم به سه ربازه کانی لیوای چوار کردو هه ندرێن-نیان به جێ هێشت.

کارێکی تر که پێویست بوو حزبی شیوعی بیکات، وه رگرتنی زانیاری رۆژانه بوو سه باره ت به وه زعی ناوخۆیی ئه و سوپایه ی که له هه ندرێن دا بوو، جووله ی رۆژانه ی، کاته کانی ئیتزارو کاتی تحلل له ئیتزارو.. تد.

سه رکردایه تی مه یدانی توانی له رێگای چه ند ئه فسه رو ده ره جه داری شیوعی ئه و زانیاریانه به ده ست بێنێ و کاتی ئیتزارو خۆ گۆرین، بزانێ که له نێوان (٤,٣٠ـ٥,٣٠) ی ئێواره یه.

هه روه ها له رووی ده رونیشه وه، سه رکرده مه یدانیه کان هه میشه سه ردانی پێشمه رگه کانیان ده کردو روحیه تی به رخودان و به رگری و

گیان فیدایان له جه سته و گیانیان دا مکوّم و پته وتر ده کردن، هه روه ها ئه و تۆمه تانه ی که خرانه پال حزبی شیوعی گوایه هه ندرینی فرۆشتوه، زیاتر هانی سه رکرادیه تیه مه یدانیه که ی ده دا به تایبه تی کمال نعمان ثابت و فاخر میرگه سوری، بۆ ئه وه ی خیرایی به نه خشه و پلانه که یان بده ن و زوو ئه و مقۆ مقۆو قسانه ره ش بکه نه وه، که روژبه روژ ده هات زیاتر بلاو ده بوه وه و ئازاری کادیره عه سکه ریه کانی حزبی شیوعی ده دا..

هه روه ها له هه مان کاتدا.. ئاگاداری مه لا مسته فای بارزانی سه رکرده ی هیزی پیشمه رگه ی کوردستان و ئیدریس ی کوری که که سی دووه م بوو کرانه وه و له وردو درشتی پلانه که و سه عاتی سفر ئاگادارکرانه وه.

به مجۆره دوای (١٠) روژ له شکانی هیزه کانی پیشمه رگه له به ری هه ندرین دا، هه موو پیداویستیه لۆجیستی و مه یدانی و ده روونی و ....تد، ئاماده کران بۆ رزگارکردنه وه ی هه ندرین.

# سەعاتی سفرو زەبری كوشندەو رزگاركردنی هەندرێن

سەركردایەتی مەیدانی شەڕی هەندرێن لە «كمال نعمان ثابت، فاخر مێرگەسۆری، ملازم خدر، ملازم عبدالرحمن وعەریف یونس» پێكهاتبوو.

ملازم عبدالرحمن و عەریف یونس لە دەستەی هێرش بوون و هەر یەكە سەرپەرشتی لقێكی دەكرد. سەعاتی سفر چواری ئێوارەی رۆژی ١٩٩٦/٥/١٢ دانا بۆ دەست پێ كردنی هێرش بەم شێوەیەی خوارەوە:

هێزەكان ببوون بەدوو لقی فیدایی.

پەلی یەكەم:

(٦٠) پێشمەرگە بوون، لەكەپكەموو، بەسەركردایەتی عەریف یونس... هێرشەكە وەك نەخشەی بۆ كێشرابوو لەكەپكەموو دەستی پێ كرد، بۆ شكاندنی هێلەكانی بەرگری و رەبیە قایمەكانی پێشەوە.

ئەو (٦٠) پێشمەرگەیە بەسەر چەند پەلێك دابەش كرابوون كەهەموویان شیوعی بوون لەوانە(زرار دەرگەلەیی، سعید حمد ئاغا مێرگەسۆری، مام صدیق كاولۆكی و مام الیاس رواندوزی و... تد).

لەبەر ئەوەی ئەو هێلە زۆر گرنگ بوو، سەركەوتنی، یانی پاكردنەوەی چیای هەندرێن، بۆیە سەركردایەتی مەیدانی وەك كاك عەتا تالەبانی لە یادداشتە دەستنووسەكەی دەڵێ:«پێویستی بەوە هەبوو كە سەركردەیەكی فاخیر سەرپەرشتی بكات، كەسیشمان لە فاخیر مێرگەسۆری فاخیر تر نەدۆزی یەوە بۆ ئەم كارە».

بۆیە لەكەپكەموو.. راستەوخۆ سەرپەرشتی ئەو بەرەیەی دەكرد، بەتایبەتی شەهید بوونی عەریف یونس، لەسەرەتای هێرشەكەدا، وای كرد كە لەهەمان كاتدا لێپرسراوێتی ئەو لقەشی بكەوێتە ئەستۆ.

بوونی فاخیر مێرگەسۆری لەگەڵ لقەكەی عەریف یونس دا، جگە لەوەی لەرووی مەعنەوی یەوە، گروتینێكی دەدایە دەستی هێرش بەرەكان، لەهەمان كاتدا موتربەكردنی بەكەسێكی شارەزاو

سه رکرده یه کی عه سکه ری ئه گه ره کانی شکان و دروست بوونی کون و که له به ر له ریزی هێرش به ره کان که متر ده کاته وه .
ماموستا بهاء الدین نوری ، کاك مسته فا چاوره ش که ئه وکاته پێشمه رگه ی ملازم عبد الرحمن بوو ، کمال شاکر له گه ڵ سعید حمه د ئاغا بوو ، جگه له چه ندین که سایه تی تر، شاهیدی بۆ رۆلی فاخیر ده ده ن و ده لێن به راستی توانی هه م جێگای عه ریف یونس بگرێته وه و هه م له رێگای جیهازی لاسلکی ده ستیه وه ، راسته وخۆ و هه میشه په یوه ندی به مسته فا بارزانی و ئیدریس هه بێت و له هه موو گۆرانکاری و سه رکه وتنه کان ئاگاداریان بکاته وه و په یوه ندیشی به هێلی دووه می شه ره که نه بری که به سه رکردایه تی ملازم عبد الرحمن بوو .

**په لی دووه م :**

به سه رۆکایه تی ملازم عبد الرحمن (عه ره ب بوو)، ئه ویش یه کێك بوو له سه رکرده شیوعیه ناوداره کانی بواری عه سکه ری ، له شه ره کانی ئه شکه وتی شه هیدان و حسن به گ و سه ری به ردی و کۆره ك رۆلی به رچاوی هه بوو ، وه ك له نه خشه که بۆی دانرابوو ، پێویست بوو هه ردوای ئه وه ی لقه که ی عه ریف یونس هێرش بکاو هێله کان بشکێنێ ئه ویش ده ست پێ بکات . ئه وانه ی که له و لقه دا بوون ده لێن : ئه گه رچی ملازم عبد الرحمن توانی پلانه که ١٠٠٪ جێ به جێ بکات ، به لام ئه گه ر هات و هه ندێك گۆرانکاری تێدا کردبایه، ره نگه ژماره ی دیله کان له چه ند سه د تێ په ری کردبایه .
پێویستیشه بگوترێ هه ردوای ده ست پێ کردنی هێرشه کان ، تۆپ و هاونه کانی شۆرش به خه ستی ره بیه کانی بۆردوومان کرد که ده ورێکی گرنگ و کاریگه ریان بینی له شکاندنی هێزه کانی حکومه ت .
به م جۆره پلانه که ١٠٠٪ سه ری گرت و ئامانجه کانی پێکان و تا (گۆژه سه عات) له هێزه کانی حکومه ت پاك کرایه وه .

## ئایا هێزه کانی پارتی به شداری شه ره که یان کرد ؟

به شداری کردن ، یان به شداری نه کردنی هێزه کانی پارتی له شه ری هه ندرێن دا ، له کاتی خۆشی دا مقۆمقۆ و بگره و به رده یه کی زۆری

په یدا کرد ، بوه هۆی ئه وه ی په یوه ندی حزبی شیوعی و پارتی تووشی ساردی بکات ، حزبی شیوعی رزگارکردنی چیای هه ندرین به داستانی قاره مانێتی و سه رکه وتنی ئیراده ی پێشمه رگه کانی داده نێ .
تاکو ئێستاش ئه ده بیاتی حزبی شیوعی به ده سکه وت و داستانێکی گه وره ی تێکۆشان و خه باتی خۆی له قه له م ده دا .
که چی ئه وه ی ئه ده بیاتی پارتی یه ... سه رکه وتنی هه ندرین بۆ حیکمه ت و ئازایه تی بارزانی و پێشمه رگه کانی ده گه ڕێنێته وه ..
به لام ئایا به راستی هێزه کانی پارتی چ رۆلیان هه بووه له و شه ره دا؟؟
مه لا مسته فا بارزانی ، سه رکرده ی شۆڕش و هێزی پێشمه رگه ی کوردستان بوو ، ئیدریس ـ یش که سی دووه م بوو ، بۆیه له چۆنیه تی به رێوه چوون و ئه نجامدانی شه ڕی هه ندرین ئاگادار ده کرانه وه ، به لام بۆ مێژوو نه بارزانی و نه ئیدریس له سه رکردایه تی مه یدانی شه ره که نه بوون . پلانی شه ره که شیان دانه ڕشتبوو ، به لکو پلانه که له لایه ن کمال نعمان و فاخر دانرابوو ، هه ر ئه وانیش جێ به جێ یان کرد رێنیه موریس ، له کتێبه که یدا (کردستان او الموت) ته ئکید له سه ر ئه و مه سه له یه ده کاته وه پلانه که شی هه روه ك له سه ره وه ی نوسراوه (مخطط معركة (هندرين) في ١٢ آذار ١٩٦٦ من المخططات الاصلية لرئيس البيشمركه «فاخر محمد») وه ك یادگار له کتێبه که یدا بلاو کردۆته وه . (بروانه به لگه نامه کان) .
کاك عزت سلێمان به گ ... که که سایه تیه کی ناسراوه و خه لکی ده رگه له یه و زۆر شاره زای چیای هه ندرێنه ، به مولکی خۆشی ده زانێ ئه وکاته ش عزه ت زیاتر له حزبی شیوعی نزیك بوو نه ك له پارتی ، چه ند که سێك له خزم و دۆست و نزیکه کانی و خه لکی ده رگه له وه ك هێزێك کۆکرده وه و به شداریان له شه ره که کرد . چونکه عزت سلێمان به گ ده یویست له وشه ره دا ناوێك بۆخۆی بخاته پال ناوبانگه که ی بۆیه به راستی هێزه که ی عزت ، وه ك پارتی به شداری له شه ره که دا نه کرد، حه قیشه کاك عزت دان به و حه قیقه ته بنێ ، چونکه هه موو ئه و که سانه ی که چاومان پێ که وتن ، به مجۆره باسی رۆلی کاك عزه ت ـ یان کرد ،له یادداشت و نووسینه کانی دیکه شدا ئه وانه ی بلاوکراونه ته وه ، یان بلاونه بونه ته وه ، نه ناوی کادیرێکی سه ربازی و

ئەلێپرسراوێکی پارتی ـمان بەرچاو کەوت کە لە شەڕەکەدا بەشداری کردبێ ، بۆیە نازانین چۆن دەکرێ ئەم شەڕە گەورە ، مێژووەکەی بەم شێوەیە بنوسرێتەوە ، کە هەندێ کەس دەیانەوێ رووی مێژوویی وراستیەکەی بگۆڕن !؟

## ئامانجە عەسکەریەکان

پاککردنەوەی زۆربەی زۆری شاخی هەندرێن ، چەند ئامانج و ئەنجامی عەسکەری بەدواوە بوو :

١ ــ دوور خستنەوەی مەترسی لەسەر بارەگاکانی مەکتەبی سیاسی ، مەکتەبی عەسکەری و بارەگای بارزانی و بارەگای حزبی شیوعی لەناوچەی بالەك .

٢ ــ تێکشکاندنی خەونی سەربازی ، چەند سەرکردەیەکی عەسکەری عیراق کە دەیانوت دەتوانین شۆڕش بەچەك لەناوببەین .

٣ ــ گەرانەوەی متمانە و باوەڕی ی و (رد اعتبار) بۆ شیوعیەکان کە خەریك بوو ، تۆمەتەکان لەناوخۆشیان لێ یان ببێتە راستی .

٤ ــ بەدیارکەوتنی تواناو زیرەکی و لێهاتویی کادیرە عەسکەریەکانی دەرچووی ئەکادیمای عەسکەری عیراقی .

٥ ــ بەدیار کەوتنی زیاتری دەوری فاخر مێرگەسوری و ناولێنانی بەقارەمانی شەڕی هەندرێن .

٦ ــ تێکشکاندنی تەواوی لیوای چواری سەربەفرقەی دوو .

٧ ــ کوژرانی دەیان سەربازو بەدیل گرتنی دەیانی تر .

٨ ــ ناچارکردنی حکومەتی عبدالرحمن عارف بۆ بیرکردنەوە لە چارەسەری سیاسی و دەست درێژکردن بۆ سەرکردایەتی شۆڕش بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆ کە ئەنجامەکەی بەیانی ٢٩ ــ ی حوزەیرانی ١٩٦٦ بوو .

## دەسکەوتەکانی شەڕەکە

ئەگەرچی راوبۆچونی جیاجیا هەیە سەبارەت بەدەسکەوتەکانی شەڕی هەندرێن ، بەلام گومانی تێدانی یە کەشەڕەکە دەسکەوتێکی زۆری هەبوو .

لەچەندین سەرچاوەی جیاجیاوە ، توانیم دەسکەوتەکان کۆبکەمەوە ، پاش بەراورد لەگەڵ یادداشتە دەستنوسەکەی کاك

عه تا تاڵه بانی ، ده توانم بڵێم ، که بریتی بوون له مانه ی خواره وه :
(چوار تۆپی قورس ، ٧ هاوه نی ١٠٥ ملم ، نزیکه ی ٢٠ تۆپی ٨٢ ملم ، ٨ ره شاشی جۆری فیکه رس ، ٨ ره شاشی برین ، ١٥ کلاشینکۆف به ئه مری بارزانی دابه ش کران به سه ر پێشمه رگه کان دا ، دووسه ندوقی ره شاش سترلینگ واته (٢٤) دانه ، ١٩ جیهازی لاسلکی ژماره ٩ ، ٥٢ جیهازی لاسلکی روسی ١٠٥ جهازی مجسس جوی، هه زاران به تانی و شتی تر) .
ته نها که سێك که به پێچه وانه ی هه موو رایه کانی تر باسی ده سکه وته کان ده کات ماموستا بهاء الدین نوری ـ یه ، له یادداشته کانیدا که له ساڵی ١٩٩٢ دا له چاپی داوه و له چاپێکه وتنێکی تایبه تیدا ده ڵێ :
( ئێمه له شه ری هه ندرێن چه کێکی که ممان گرت ، سێ چوار غه داره ی ئیسترلنیگ و چه ند پارچه یه کی تر...) .
واپێ ده چێ ده سکه وته کانی شه ری هه ندرێن گۆیه ندی زۆری نابێته وه ، له ناوخودی کادیرو عه سکه ریه کانی حزبی شیوعی له لایه ك و له نێوان حزبی شیوعی و پارتی له لایه کی دیکه وه .
هه ندێ له سه رکرده کان و کادیره کانی حزب له و باوه ره دابوون که هه موو ده سکه وته کانی شه ری هه ندرێن ده بێ بدرێته حزبی شیوعی که چی ژماره یه کی تر له و رایه دابوون که پێویسته چه که قورسه کان ته سلیم به سه رکردایه تی شۆرش بکرێنه وه ، که چی عه تا تاڵه بانی ده ڵێ به لیستێکی تایبه تی هه موو چه ك و ده سکه وته گه وره کانمان ته سلیم به بارزانی کرده وه .

## بۆچی چیای هه ندرێن هه مووی رزگار نه کرا ؟

پاش ئه وه ی لقه که ی شه هید عه ریف یونس به سه رکردایه تی فاخر مێرگه سۆری هێزه کانی حکومه تی شکاندو هێله کانی به رگری و ئه و ره بیانه ی بۆی دانرابوون گیران و رزگار کران و هێزه کانی حکومه ت ده ستی به هه ڵاتن کرد هێزه که ی ملازم عبد الرحمن ـ یش به شه که ی خۆی له پلانه که ته واو کردو تا (گۆره سه عات) هه مووی پاك کرایه وه.
فاخیر مێرگه سوری که جیهازێکی لاسلکی پێشکه وتووی لابوو ، کاتی خۆی مه لا مسته فا پێ ی دابوو ، به به رده وامی له گه ڵ

مه لامسته فاو ئیدریس قسه ی ده کرد ، دیاره زۆر هه وڵی داوه که باوه ڕ به بارزانی بێنێ هێزه کانی پێشڕه وی بکه ن و هه مووچیاکه ئازادبکه ن تا ده گه نه حامیه ی رواندز .

به ڵام بارزانی ئه وکاره ی به مجازه فه داناوه و له وباوه ڕه دا بووه که پێویسته سه رکه وتنه که بپارێزێ و له (گۆزه سه عات) زیاتر پێشڕه وی نه کرێ .

دیاره فاخیر مێرگه سوری ، له که ش و هه وای سه رکه وتندا ویستویه تی بره و به پێشڕه وی هێزه کانی بدا ، بۆیه وه ك کاك عه تا تاڵه بانی بۆی گێرامه وه ، په نای بردۆته به ر ئه و بۆئه وه ی قسه له گه ڵ بارزانی بکات و قه ناعه تی پێ بکات ، به ڵام دیاره بارزانی قه ناعه تی به عه تا تاڵه بانی ــ یش نه کردووه هه ر له سه ر ئه وره ئیه بووه که پێویسته له (گۆزه سه عات) هێزه کان بوه ستێنرێ .

به مجۆره فاخیر مێرگه سوری بریاری بارزانی جێ به جێ کردووه هێزه کان له وه زیاتر پێشڕه ویان نه کرد .

ئه و په یوه ندی یه توندو تۆڵه ی فاخیر له گه ڵ بارزانی و ئیدریس دا ، به زۆر له سه ری که وت ، خه تی راسته وی (یه مینی) حزب که وته دژایه تی فاخیرو به وه تاوانباری کرد که ، هه ر له وڕۆژه وه خه ت و په یوه ندی له گه ڵ بارزانی و ئیدریس دا په یدا کرد .

## ده ره نجام

زۆر که س ده یانه وێ ته م و مژێک نه سه رده وری فاخیر مێرگه سوری، یان ده وری به لاوه کی له قه ڵه م بده ن ، به ڵام ئه و یادداشت و ده ست نوسانه ی که بینیمان یان له چاوپێکه وتنه تایبه تیه کانماندا له گه ڵ ئه و که سایه تی و پێشمه رگانه ی که راسته وخۆ له شه ڕی هه ندرێن به شداریان کردووه . به یه کێ له سه رکرده کانی ئه وشه ڕه ی ده زانن . هه موو هه ڵسوکه وت و رواڵه ته کان و رۆژانی شه ره کانیش به ڵگه ی حاشا هه ڵنه گرن، .

که فاخیر ئه ندامی سه رکردایه تی مه یدانی و سه رکرده ی هێرشی به ره ی (که پکه موو) بوو ، ته نانه ت له کاتی پێویستدا به ناوی بارزانی و ئیدریس بروسکه ی بۆ هێزه کان لێ داوه ، یه کێك له وانه (حاجی بێ رۆخی) بوو ، که به ناوی بارزانی بروسکه ی بۆ لێداوه ،

هەروەها کاك عزت سلیمان بەگ ـ یش لە کتێبەکەیدا نامەیەکی فاخیر مێرگەسۆری لەو بابەتە بڵاو کردۆتەوە .

## سەرچاوەکان


١) بیری نوێ، ژمارە (٦) (٢٤٥) ساڵی (١٤) حوزەیرانی ١٩٨٦
٢) مذکرات بهاءالدین نوري/ الطبعة الاولی تشرین الثاني ١٩٩٢
٣) لە چاوپێکەوتنێکمان لەگەڵ بهاءالدین نوري هاوینی/١٩٩٦
٤) چاوپێکەوتنێکمان لەگەڵ کمال شاکر/ هاوینی ١٩٩٦
٥) دەست نوسەکەی عەتا تاڵەبانی بەزمانی عەرەبی

ـ کاتێك که فاخیر میرگه سوری ده ست به سه ربوو به رله وه ی بێ سه رو شوێن بێت ده یتوانی رابکات و خۆی بگه یێنێته به غدا هه موو ئه و به ڵگانه ی که له بن ده ستێ ته ئکید له سه ر ئه وه ده که نه وه ، که کاتێ فاخیر میرگه سوری له ساڵی ١٩٧١ له دیلمان ـ ی باڵه پیاندا له لایه ن مه لا مسته فای بارزانی ده ست به سه ر بوو ده یتوانی له گه ڵ عبید الله بارزانی کوڕی مه لا مسته فا خۆی رزگار بکات و عبید الله له پرسه ی شه هیدانی بنه ماڵه ی میرگه سوڕیدا به م شێوه یه باسی په یوه ندی خۆی و فاخیری کرد که چۆن هه وڵی له گه ڵ داوه ، دیلمان به جێ بێڵن و خۆیان بگه یێننه به غدا :

(پێش ئه وه ی خۆم له ده ستی باوکم قوتار بکه م ، (.......) هاته لام و پێ ی وتم : ئه گه ر خۆت رزگار نه که ی ئه وامه لا مسته فای باوکت ، تۆ و فاخیر ده کوژێت ، منیش کاغه زێکم بۆ فاخیر نوسی و بریاری مه لامسته فاو نیازه که یم بۆرروون کرده وه) .

عبید الله ئه وقسانه ی له دانیشتنێك دا کردوه که زۆربه ی ئه وکه سانه ی له وێدا بون و ماون و له ژیان دان

عبید الله له قسه کانیدا به رده وام ده بێت و ده ڵێ :

(فاخیر له وه ڵامدا زۆر به توندی پێشنیاری راکردن و خۆرزگار کردن و گه رانه وه بۆ به غدا ره ت کرده وه و ئه م بیرۆکه ی لاپه سه ند نه بوو) عبید الله زۆر به راشکاوی له دانیشتنه که دا؛ وتبووی فاخیر بۆی نوسیبوم باجاشایه تی پیرۆزی خۆت بێت و بۆ دڵوپێك خوێن ناپارێمه وه عبید الله له هه مان دانیشتندا وتبوی :

(کاغه زی دووه م بۆناردو داوام لێ کرد که خۆی رزگار بکات به ڵام دیسان پێشنیاره که ی منی په سه ند نه کردوو به م شێوه یه وه ڵامی دامه وه :

من پیاوێکی خه باتگێرم و ده مه وێت تابمێنم خزمه تی میله ته که م بکه م و مێژووی ژیان و خه باتی خۆم ره ش ناکه م) .

وا پێ ده چێ عبید الله بارزانی له بریاری باوکی دڵنیا بێت و بۆیه پلانی راکردنی دارشتبوو و چۆنیه تی راکردنه که ی خۆی به م شێوه یه ده گێرێته وه :

( ئه وشه وه ی که ویستیان من ببه ن بۆ کوشتن ، (.......) ی

پاسەوانەکەم هاتەلام و وتی ئەم شەو دەتکوژن ، بۆیە ناچار بووم بۆ دێ ی (گوندە ژوور) رابکەم و لەکۆلیتەکانی مەڕومالاتی مالی (....) خۆم حەشاربدەم ، لەوێش دیسان نامەیەکی ترم بۆ فاخیر نوسی و داوام لێ کرد رابکات و بێتە لام بۆ دەربازکردن بۆ ئەوەی پێکەوە بڕۆین بەتایبەتی کە هەموو مەسەلەکانم بۆ خۆ دەربازکردن تەرتیب کرد بوو ، بەلام بەداخەوە پاش سێ رۆژ چاوەروانی هیچ وەلامی نەبوو

هەروەها عبید الله وتبوی بەهەرشێوەیەك بێت خۆم گەیاندە بارزان و سەعیدی برای فاخیرم بینی کە دوای تۆلە کردنەوە لە بکوژانی (جمیل)ی برا کەی رای کردبوو بۆ بارزان و لەرێ چووبوە لای شێخ عوسمان کوری شێخ ئەحمەدی بارزان و، بۆ ئەوەی کەس دەستی نەگاتێ ، زۆر داواشم لەسعید کرد کە لەگەلدا بێت بۆ بەغدا بەلام پێ ی وتم : (کاك فاخیر کاغەزی بۆ نوسیوم کە نابێت بڕۆم بۆناو حکومەت) .

سەرەرای زۆر گوتن و داوا کردنێکی زۆر نەمتوانی سەعید ئاغا بێنمەسەر رێ و لەگەلدا بێت .

***

دوای راکردنی عبید الله ، مەلا مستەفا بۆماوەی ١٥ رۆژ فاخیری ئازاد کردبوو هاتە مالەوە بەلام جارێکی دیکەش گرتیەوە ئیتر ئەوەدوا گیران و بەزرکردنی فاخیر مێرگەسوری بوو ، سەرەرای ئەوەی کە ئەمە هەلوێستی فاخیر مێرگەسوری بوو بەهیچ شێوەیەك قبولی نەکردوە بچێتە باوەشی حکومەتەوە بەلام سەرکردایەتی بارزانی هەمیشە ترسی ئەوەی هەبوو کە فاخر لەدەستیان رابکات بۆیە لەکاتی زیندان و دەست بەسەریدا لەژێر چاودێریەکی توندابوو، جمیل محۆی سەرۆکی حزبی دیموقراطی لوبنانی لەیادداشتنامەکەیدا کەلەزیندانەکانی بارزانی لەژێر ناونیشانی (مذکرات داخل سجون الثورة الکردیة) نوسیویەتی و دەلێ:

(کاتی منیان گواستەوە بۆ بەندیخانەی خەلان ، هێزێکی زۆریان لەو گوندە دانابوو و چوار دەوری زیندانەکەیان پێ گرتبوو ، بۆ

ئه‌وه‌ی رێ له‌وه‌ بگرن ، ئه‌وه‌ك له‌ لایه‌ن هه‌وادارو دۆستانی له‌زیندانی خه‌لان ئازاد بکرێ ئه‌گه‌ر چی ئه‌و رۆژه‌ی منیان گواسته‌وه‌ زیندانی خه‌لان ئه‌ویان له‌و زیندانه‌ لابرد بوو نازانم بۆ کوێیان بردبوو .، هه‌ندێك ده‌ڵێن بۆ زیندانی رایات‌و هه‌ندێکیش بۆ ئێران ) .

* کوردستانی نوێ پێنج شه‌ممه‌ ١٩٩٥/٢/٢٣ ژماره‌ ٩٢٤ جێگر مێرگه‌ سوری

فاخر ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی كه‌شیوعی بوو، هێشتا گه‌نج بوو، له‌ ساڵی (١٩٥٨_١٩٦٣) ئه‌و بواره‌ی بۆ نه‌ره‌خسا كه‌ فه‌رمانبه‌ری گه‌وره‌و ده‌سه‌ڵاتدار بناسێ، ته‌نها سه‌ركرده‌كانی حزبی شیوعی ده‌ناسێ، بۆیه‌ تاكو ده‌رچوونی به‌یاننامه‌ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ ته‌نها له‌ناو شۆڕشدا زۆرناسراوبوو به‌ڵام دوای ده‌رچوونی به‌یاننامه‌كه‌ له‌به‌غدا سه‌عدون غیدان و ناظم گزاری ناسی كه‌دووكه‌سایه‌تی به‌هێزی حزبی به‌عس بوون، له‌سلێمانیش شكری الحدیثي كه‌ پارێزگاری سلێمانی بوو، طه‌ الشكرچی سه‌ر كرده‌یه‌كی عه‌سكه‌ری ناسراو بوو احمد عبدالقادر نه‌قشبه‌ندی ناسی، حكومه‌تی مه‌ركه‌زی وای پێ باش بوو كه‌ فاخر مێرگه‌سۆری ببێته‌ ئامر حه‌ره‌س حدود، ده‌ست نیشان كردنی مێرگه‌سۆری بۆ ئه‌م مه‌سئولیه‌ته‌ ره‌نگه‌ دوو مه‌رامی له‌دواوه‌ بووبێ: یه‌كه‌میان: ده‌یانزانی ناخۆشی له‌گه‌ڵ بارزانی دا هه‌بووه‌، ره‌نگه‌ مرخی خۆیان بۆ ئه‌وه‌ خۆش كردبێ كه‌ به‌و رێگایه‌ ده‌توانن تۆی دوو به‌ره‌كی له‌ نێوانیان دا بروێنن.، دووه‌میشیان: به‌لای خۆیاندا رای بكێشن،

به‌ڵام ئایا راسته‌ فاخر په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ حكومه‌تدا دروست كردبوو؟ نۆكه‌رو پیاوی حكومه‌ت بوو؟ بۆیه‌ ماڵی بارزانی كوشتیان ؟! نكوڵی له‌وه‌ ناكرێ كه‌ فاخر تا كوژرانیشی هه‌ر خه‌ریكی په‌ت په‌تێن بوو له‌ناو حزبی شیوعیدا له‌ سه‌كۆیه‌كه‌وه‌ بازی ده‌دایه‌ سه‌ كۆیه‌كی تر، دواتریش وازی له‌حزبی شیوعی هێناو بوو به‌ پارتی، له‌ ناو پارتیشدا ئۆقره‌ی نه‌ده‌گرت حه‌زی به‌وه‌ ده‌كرد زیاتر به‌ره‌و چه‌پی ببا، به‌ڵام ئه‌وانه‌ی كه‌ له‌فاخره‌وه‌ نزیكن ده‌ڵێن: هه‌رگیز ئه‌م راراییی و په‌ت په‌تێنه‌ی فاخر له‌سه‌ر حسابی باوه‌ڕی به‌كوردایه‌تی و خه‌باتی شۆڕشگێری نه‌بوو، راسته‌ بۆ مێژووی خه‌بات و تێكۆشانی خۆی به‌ پێوه‌ری حزبایه‌تی ئه‌وكات ئه‌و ره‌وشته‌ی فاخر كارێكی باش نه‌بوو، باجێكی قورسیشی له‌ئاكامی ئه‌و په‌ت په‌تێنه‌دا، به‌ڵام به‌خائین و جاسوس له‌ قه‌له‌م دانی له‌لایه‌ن بنه‌ماڵه‌ی بارزانی پێویستی به‌ هه‌ڵوه‌سته‌یه‌كی قووڵ و له‌سه‌ر خۆ هه‌یه‌، پاساوی كوشتنیشی هه‌ر له‌به‌ر ئه‌و هۆیه‌ مه‌سه‌له‌یه‌كی

واناسان و سه رپێ ی نیه ، چونکه فاخر کادرێکی پێشکه وتووی حزبی شیوعی بوو ، لێپرسراوی چه ندین هێزی پێشمه رگه ی کردوه و دواتریش ئه ندامی لیژنه ی مه رکه زی پارتی بوو تا دوا رۆژی ژیانیشی هیچ به ڵگه یه ك بڵاو نه کراوه ته وه فاخر به جاسوس و نۆکه ری حکومه ت تاوانبار بکات ، فاخر دوای به یاننامه ی ئازار خاوه ن بیرو بۆچوونێکی نوێ بوو بۆ چۆنێتی ئیداره کردنی کوردستان ، گۆڕینی پارتی بۆ حزبێکی پێشکه وتن خواز ، دوور خستنه وه ی له ئێران و له کاریگه رێتی شاو ساواك . هه ر بۆیه ش له لایه ن ئێرانی یه کانه وه خۆشه ویست نه بوو ، به مجۆره پاراستن که به شێك بوو له ساواك رۆژ به رۆژ رقی له فاخر ئه ستوور تر ده بوو ، فاخر ته نها نه بووه نێچیری یه ك پیلان و رق و تۆڵه ، به ڵکو له زۆر لاوه گه مارۆ درابوو ، دواتریش له به رده م پیلانه کانی پاراستن خۆی نه گرت ، بۆیه ئه گه ر له به ر جاسووسی و خائینی ئیعدام کرابێ پێویست بوو له سه ر سه رکردایه تی بارزانی به یاننامه یه ك ، روونکردنه وه یه ك یان هه واڵێك به به ڵگه وه بڵاو بکاته وه ئه و کاتیش که س ره حمی به فاخر نه ده کردو ئه و هه راو هوریایه ی له دوای خۆی به جێ نه ده هێشت و کوشتنیشی نه ده بووه مۆرێکی ره ش به نێو چه وانی بارزانی و هه ردوو کوره که یه وه (ئیدریس و مه سعود). ته نها قسه یه ك که تاکو ئێستا سه باره ت به کوشتنی فاخر له لایه ن پارتی و بنه ماڵه ی بارزانیه وه گوترابێ ، ئه و دیمانه ته له فزیۆنیه بوو که له (١٩٩٥/٢/٤\٣) ته له فزیۆنی گوڵان له گه ڵ فرانسۆ حه ریری کردی سه باره ت به و قسه یه ی که گوایه فاخر ده ستی له گه ڵ حکومه ت هه بووه ، به و مانایه گوتی: «له کاتی گفتوگۆ له گه ڵ رژێمدا من و فاخر چووین بۆ به غدا، جه لال تاڵه بانی ئه وکاته له گه ڵ رژێم بوو ، فاخر هه وڵی دا جه لال تاڵه بانی بێنێته وه ناو شۆڕش ، جه لال تاڵه بانی به منی گوت که گه رایته وه لای بارزانی پێ ی رابگه یه نه که وا فاخر مێرگه سووری ده ستی له گه ڵ رژێم تێکه ڵ کردووه ». فره نسۆ له قسه کانیدا هه ر به و مانایه گوتی: «من زۆر پرسیارم له خۆم کرد ده بێ جه لال بۆ وابڵێ ، دوای ئه وه ی بۆم ده رکه وت که خه ڵکی سلێمانی و که رکوك زۆر ته ئیدی فاخریان ده کرد له گه ڵ ئه وه شدا به بارزانیم راگه یاند ، که جه لالیش هاته وه پێ ی گوتم به بارزانیت راگه یاند من گوتم «نه »»، هه ر بۆ ئه وه ش وام پێ گوت تا

خۆی به بارزانی بڵێ دوایی که چوینه لای بارزانی، هه مان قسه ی لای بارزانی دووباره کرده وه». له وه ڵامی ئه و قسه یه ی فه ره نسۆ مام جه‌لال له دانیشتنێکیدا له گه ڵ بنه ماڵه ی مێرگه سۆری و خزمانی شێروانیدا له رۆژی ۱۹۹۵/۲/۹ له کۆیه، قسه کانی فره نسۆ به درۆ ده خاته وه و گوتی*:

ـ بنه ماڵه ی ئاشبه تاڵ بێ وه فایی و ناجوامێریان به رامبه ر به برایانی شێروانیان کردووه، ئه گینا ده بووایه هه ر له به ر خاتری شه هید (حوسێن) که له سه ر بارزان شه هید بوو، ئه وه یان بۆ حه مه د ئاغا حساب بکردبا، که ئه و هه موو خزمه ته ی کرد له شۆرشی یه که م، له کۆماری مهاباد.

شه هید فاخیر چی بۆ نه کردبوون له سلێمانی و که رکوك و ئه و ناوچانه؟.

ـ شه هید فاخیر وه کو کێوێك بوو له سه ر دڵیان، پێ یان ناخۆشبوو پیاوێکی زیره ك و عاقڵ و ئازای وه کو ئه و هه ڵکه وێ، ئه وانه بۆ کورد فه وتاندن دروست بوونه و وه کو سه ره تانێکن له له شی میلله تی کورد.

به راستی ئه و بنه ماڵه یه له هه ر شتێك بن تێکی ده ده ن، شۆرشی کوردیان له ساڵی ۱۹۷۵ تێك داو کۆتایی یه که یان به وه هێنا ، حه مه د ئاغا و کورانیان قه تل و عام کرد له جیاتی ئه وه ی خه ڵاتیان بکه ن.

سه باره ت به رووداوی کوشتنی شه هید فاخیر مێرگه سوری وتی:

قسه کانی فه ره نسۆ حه ریری درۆیه کی شاخداره چونکه دژایه تی شه هید فاخیر له ساڵی ۱۹۵۸ـ ه وه ده ستی پێکرد، ئه وکاته ئێمه له گه ڵ بارزانی له یه ك حزبدا بووین ، له هه راکه ی لۆلان که چوونه سه ر عه شیره تی برادۆست بارزانی ئه و شته ی بۆ شه هید فاخیر هه ڵبه ست که گوایه گولله ی له ئه و داوه و له سه ر ئه وه له گه ڵ حزبی شیوعی کردی به هه ڵلا.

دواتر له به ر ئه وه ی شه هید فاخیر پیاوێکی قاره مان بوو ناچاربوون رایکێشنه وه ناو شۆرش چونکه وه زعیان خراپ بوو له سلێمانی ته نانه ت ناردبوویان بۆ شه ری ئێمه تا هه ر لایه کمان له ناو

* کوردستانی نوێ، ژماره ۹۱۱، ۱۹۹۵/۲/۱۰

بچی به حسابی ئه وان قازانجیانه. هاتنه وه ی ئیمه له سالی ۱۹۷۰ به هۆی شه هید فاخیره وه بوو ،ئه و نه با، به که س باوه ڕم نه بوو بیمه وه، کاتی خۆی له چۆمان له گه ڵ شه هید فاخیر به یه که وه بووین هه میشه پیم ده گووت که ئاگات له خۆت بیت (ئه وه برایه کتیان کوشت ئه م جاره نۆره ی تۆیه).

ئه گه ر فاخیر له گه ڵ حکومه ت ده ستی هه با دانه ده نیشت ملی خۆی بخاته به ر شیری ئه وان ئه سله ن زاتیان نه ده کرد بیگرن پاشان بۆچی نه یان داوه دادگای شۆڕش خۆیان باش ده زانن فاخیر کورد په روه رو شۆڕشگێربوو

وه هه روه ها سه باره ت به وه ی که ئایا فاخر ده ستی له گه ڵ حکومه-تدا په یدا کردبوو گوتی:* «ئه وه نده ی من ئاگام لێ بیت شه هید فاخر، نه ك ده ستی له گه ڵ حکومه ت تێکه ڵاو نه کردبوو، به ڵکو دژی حکومه ت بوو، تاراده یه کیش له بن کاریگه رێتی حزبی شیوعی عیراقیدا بوو، بیروڕای حزبی شیوعیش ئه و سه رده مه ئه و نه بوو که له گه ڵ حکومه تی عیراقی ده ست تێکه ڵاو بکه ن، شه هید فاخر نۆکه ر یان پیاوی حکومه تی عیراق بووبێ، ئه وه هیچ بنه مایه کی نی یه، ئه ویش وه ك هه موو به رپرسێك ئه وه نده ی په یوه ندی به حکومه ت هه بوو، که ئه وسا حکومه ت له گه ڵ کورد هه یبوو،» بۆیه کوشتنی فاخرو قه تلو عام کردنی بنه ماڵه که ی به وشێوازه ی که بنه-ماڵه ی بارزانی پاساوی بۆ دێنێته وه کارێکی به ده ر له هه موو عورف و یاساو نه رێتێکه وه تاکو ئێستاش جگه له خۆیان که س ئافه رینی بۆ نه کردوون ته نانه ت ئه و که سانه ی له شۆڕشی ئه یلولدا کاربه ده-ست بوون به کارێکی دڕنده و جینایه تێکی گه وره ی ده زانن.

ره نگه ئه گه فاخر پیاوی حکومه ت بوایه ژیانی به مجۆره کۆتایی پێ نه ده هات، به تایبه تی که ده رفه تی زۆری له به رده م دابوو له سه ر ده می ده ست به سه ریدا رابکات و خۆبگه یه نێته ناو حکومه ت و پله و پایه ی به رزی بدرێتێ به ڵام هه موو ئه و که سانه ی که چاوپێکه وتنم له گه ڵ کردوون ئه و تۆمه ته ی بنه ماڵه ی بارزانی

* چاوپێکه وتنێکی تایبه ت ۱۹۹۷/٤/٦ ـ سلێمانی

ره ت ده كه نه وه ، له راستیشدا كوشتنی فاخرو باوك و براكانی له زنجیره ی ئه و كاره تیرۆریست و شه ره نگیزانه ی بنه ماله ی بارزانی داده نرێت كه نه ك هه ر ته نها ده رحه ق به ئه وان ئه نجامیان داوه به لكو دژی هه موو نیشتمان په روه رو كوردی دلسۆزو بنه ماله و عه شیره ته كانی كوردستان كردوویانه تاكو ئێستاش له سه ری به رده وام بوون و خۆی گه یاندۆته ئاقاری خۆفرۆشی و كورد فرۆشی و نیشتمان فرۆشی له پێناوی مانه وه یاندا.

# فاخر مێرگه سۆری

## شه هیدی شۆڕشگێری بێگه رد

فاخیر مێرگه سۆری زۆر ناسراوه، به لام بۆ ئه و گه نجانه ی که له گه ڵ رووداوه کانی پێش ساڵی ١٩٧٥ نه ژیاون ئه م چه ند دێڕه یان بۆ له رۆژنامه ی (الغد) دا بلاو ده که ینه وه.

کوڕی حمه د مێرگه سۆری سه رۆکی یه کێك له عه شیره ته کانی بارزانه و یه کێکه له گه وره ترین سه رکرده کانی بزافه یه ك له دوایبه- -کانی بارزان دژ به حکومه ته کانی عیراق .. له گه ڵ شۆڕشگێره کانی دیکه له ساڵی ١٩٤٥ دا کشانه وه بۆ یه کێتی سۆڤیه ت، دوای هه ره س هێنانی بزافی بارزانی یه کان له و ساڵه دا. له دوای شۆڕشی ١٤ ی ته مموز له ساڵی ١٩٥٨ دا گه ڕایه وه عیراق.

له و ماوه یه دا فاخر هه روه کو هه موو منداڵه بارزانیه کانی تر وبراکانی له رۆڵه کانی گه لی کورد دا، ده ربه ده ربووه، دووچاری مه ینه تی بووه.

هه ر له منداڵی یه وه چووه ته ریزی حزبی شیوعی عیراق، زۆر ئازاو به جه رگ بوو، هه میشه به چاوێکی سووك ته ماشای حوکمی پاشایه تی له عیراقدا ده کرد، هه ر له به ر ئه وه چه ندین جار زیندانی کراوه، هه روه ك چۆن له ونامه یه یدا که بلاوی ده که ینه وه ئاماژه ی بۆ ده کا.

فاخر رۆڵێکی به رچاوی بینیوه له سه رکوتکردنی بزووتنه وه یاخیه که ی ره شید لۆلان ـ ی دواکه وتوو له ساڵی ١٩٥٨ــ ١٩٥٩ دا، دواتر چووه ریزی بزووتنه وه ی چه کداری کورد، بووه ته یه کێك له سه رکرده ناسراوه کانی، که (قیاده ی مه رکه زی) حزبی شیوعی عیراق هاته کایه وه، خۆی و باوکی له هه واداره نزیکه کانی بوون، به لام حه زی کرد له ریزه کانی پارتی دیموکراتی کوردستان دا کار

بکات. لەگەڵ ئەو گۆڕانەی کە بەسەر شۆڕشدا هات، فاخرو براکانی وخزمەکانی لە شۆڕش دوورخرانەوە.
دوای ئیمزاکردنی رێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ لە نێوان صدام تکریتی و شای لابراودا ،حوکمی ئیعدامان بەسەردا جێ بە جێ کردن.

## دیکیۆمینتێك بە دەستوخەتی خۆی

ئەو مەینەتی و دەردەسەرییەی بەسەر گەلی کورددا هاتوون، ئەوەندە گەورەن، هەموو لایەنەکانی ژیان و میراتەکەی گرتووەتەوە و رەنگ ورووی خۆی بەسەردا جێ هێشتوون، رووبەرووبونەوە چۆن بێت دەست مایەش لەو سەرچاوە دەگرێ ، لەم روانگەوە مێژووی ئەو گەلە قارەمانە تۆمار کراوە، بۆ گیانی قارەمانێتی لەسەر ئاستی تاکەکەسی و وکۆمەڵدا لە ناویاندا سەری هەڵداوە، تاوای لێ هاتووە چیاکانی کوردستان بوونەتە سومبلی عاشقانی سەربەخۆیی لەو ناوچەیەی جیهان دا ، کە تاکو ئێستاش بوەتە گۆڕەپانی چاوبزکێی هێرش بەرەکان لە هەموو کون و قوژبنێکدا.
لە دوو توێی ئەم تۆمارەدا وێنەی رەنگاورەنگی قارەمانی نەمر فاخیر مێرگەسۆری و باوکی و براکانی لە ئاسۆدا بەدیار دەکەوت، فاخیر خۆی لایەنێکی ئەو وێنەیە دەکێشێ و ئێمەش لایەنەکی دیکەی، کە خۆمان لەگەڵیدا ژیاوین ودەیخەینە سەر لایەنەکەی تری:
فاخیر دەیتوانی بژی... بەڵام مردنی لاگە ورەتر بوو، بەمجۆرە قارەمانانە ، ئەو سەرکردە کۆتایی بە ژیانی خۆی و بنەماڵەکەی هێنا ، بۆ ئەوەی مێژووی گەلەکەی مۆرکی خیانەت و سازش و پاشەکشەی پێوە نەبێ .. لەگەڵ رەگەی رەوتی پەیوەندییە خێڵەکیەکانی نێوکۆمەڵی کوردەواریدا ، کە تاکو ئێستاش هەر ماوە، فاخیر خۆی لەبەرامبەر (خەیار)ێکی گران دەبینێتەوە: یان بەدەستی کوردە وە بمرێ، یان لەگەڵ فاشیەرەگەز پەرستەکانی دوژمنانی کورد بژی، خەیاری سێیەمیشی لەبەردەمدا نەبوو، لە ژێر رۆشنایی بارودۆخی ئەوکات:

یاخی بوون له به رامبه ر سه رکردایه تی دواکه وتوو، که ته ئیدی ته واوی هه بوو، ته نها مانای ئه وه ی ده به خشی که خه نجه ری له پشتی گه له که ی ده داو خه باتی رزگاریخوازانه ی پارچه پارچه ده کرد، له کاتێکدا که دوژمن خۆی بۆ شه ڕێکی یه کلاکه ره وه ئاماده ده کرد. فاخروبنه ماڵه که ی خۆیان له نێوان دووتای ته رازوودا دۆزی یه وه، له گه ڵ هاوڕێ و هه ڤاڵه کانی ڕێگای شۆڕش قسه یان کرد، له و دوو ڕێگایه دا، به شه ره فترین ڕێگایان هه ڵبژارد، به ڵام ده یانزانی له هه مان کاتدا ده که ونه به ر لێشاوی تۆمه تی درۆ بۆ حه لال کردنی خوێنه کانیان له لایه ن ئه و لێپرسراوانه دا.

له کاتێکدا ئه م دیکیۆمێنته بڵاو ده که ینه وه ،که بریتی یه ئه نامه یه کیدا بۆ یه کێ له دلسۆزه کانی ــپێویسته ئه وه ش به بیر خه ڵك بێنینه وه ، ئێمه ش له گه ڵ هه موو ئه و که سانه ی که دواڕۆژی کوردستانیان لامه به سته ، ئاکامه کانی ئه و خه یاره ی فاخر له به رچاو بگرین.

ئه گه ر هات و جۆره غه درێکی پێوه دیاره، ئه وا ناتوانین پاکانه ی بۆبکه ین ، وه ئه گه ر ئه و کاره ی فاخرو براکانی وباوکه پیرو منداڵه کانیان کردیان کارێکی راست بوو، ئه وا پێویسته به لایه نی که مه وه سنووری ته کتیك و به ربه سته کانی وه لانێین و مجامه له کردن له بیر بکه ین ، بۆ ئه وه ی وه فا و دلسۆزی به رامبه ریان بنوێنین

یاده کانیان بگرینه ئه ستۆ بۆ ئه وه ی له بیر نه کرێن .. بۆچی نابێ وابکه ین .. ئه وان نموونه ی کوردستان و وێنه ی مێژووی خوێناویه که ی گه له که یانن .

## دەقی نامەکە بە زمانی کوردی

حاجی ئۆمەران
١٩٧١/٦/٨

برای خۆشەویست ......ی بەڕێز

دوای سڵاو و راستگۆیی

نامە جوانەکەتم بەدەست گەیشت ، کە پڕ بوو لە گەورەترین و ناسکترین هەستی خۆشەویستی ، سوپاسی هەستی بەرزت دەکەم ، هیوادارم خوای گەورە لە هەموو ناخۆشی یەك بتپارێزێ. برام : ژیان تێکۆشانە ، رێگای تێکۆشانیش بێ کەندو کۆسپە نابێت ، پڕیەتی لە ناخۆشی و دەردە سەری ، بەڵام هیچ هێزێك وبەربەستێك ناتوانێ لە بەردەم بڕیارو توانای دلسۆزو تێکۆشەران بوەستێ ، لە پێناو کێشەی گەل و نەتەوەکەیاندا.

ئەوەی کە تووشم هاتووەو رووبەرووم بووەتەوە ، شتێکی نوێ نی یە ، مێژووی شۆڕش و میللەتان گەنجینەیەکە بۆ چەندین نموونەی لەو بابەتانەی کە تووشم هاتوون ، بەڵام سەرکەوتن هەر بۆ راستی و دلسۆزی دەبێ ، ئەگەر ئەمرۆش نەبێ ئەوا بەیانی .

برام: لە ساڵی ١٩٥٠ دا ، چومە ناو گەمەی ململانێ ی سیاسی ، چەند جارێ تووشی زیندان و گرتن و راوەدونانی پیاوانی ئەمن و پۆلیس بوومەتەوە . چەندین جاریش دووچاری ناخۆشترین ساتەکانی هەژاری و پەژارەیی وترسناکی هاتووم ، بەڵام بڕیارو باوەڕ بەخۆبوونم هەولی دوژمنانی پەکخست . باوەڕ بکە رۆژێکی هێمنم لە ژیانی خۆمدا نەدیوە ، بە پێچەوانەوە کێشەو سەر ئێشە هەمیشە لە تەکمدا ژیاون و نزیکترین وناپاکترین دۆستم بوون .

بەڵام ئیرادەو دلسۆزی خۆم بۆ گەل و شۆڕش وسەرکردایەتی یەکەی ، لەو دۆستە بەهێزترە .

لە دانوستاندنەکانی ساڵی ١٩٦٤ دا، لەگەڵ لەوە بۆ رانیە دووریان خستمەوە، بێ هیچ هۆیەك وپاساوێك.

لە دانوستاندنەکانی ساڵی (١٩٦٦) یشدا، لە دوای شەڕی هەندرێن بۆ ماوەی نۆ مانگ ، بێ ئیش بووم و تەجمید کرام .وە لە ساڵی ١٩٦٧ دا ،بۆ ماوەی حەوت مانگ تەجمید کرام، لە مانگی (١٠)ی ساڵی ١٩٦٧ دا لە سەر بڕیاری سەرکردەی شۆڕش گەڕامەوە بۆ کاری سەربازی ،

وه دوای ئه وه ی کۆنترۆڵی ته واوم به سه ر ناوچه ی به مۆدا کرد له ١٩٦٨ ،دیسان تا مانگی یه کی ساڵی ١٩٦٩ ته جمید کرامه وه ، ئینجا لێدانی کۆمپانیای نه وت ـیان پێ سپاردم وکاره که م به ئه مانه ته وه ئه‌نجام دا، دیسان له کار دووریان خستمه وه تا مانگی چواری ١٩٦٩ . له ١٩٦٩/٤/١٧ دا سه رکرده ی شۆڕش ته کلیفی کردم هێرش بکه ینه سه‌ر قه لادزه و له ١٩٦٩/٥/٢٢ رزگامان کردو یه که م شاربوو که وته ژێر کۆنترۆڵی شۆڕشه وه ، له ١٩٦٩/٤/١٢دا دوای شه هید بوونی قاره مان عه زیز ئه ترووشی، به پیر هێزی خه باته وه چووین ، پاش به‌شداری یه کی کاریگه رمان له رزگارکردنه وه ی ئه و شوێن و گوندو ناوچانه ی که هێزی خه بات له ده ستی دابوون ، به پێ ی بڕیارێکی سه رکرده ی شۆڕش بووم به ئامر هێزی رزگاری، له کاتێکدا ئه و مه سئولیه ته م وه رگرت که باره گای هێز (سه رگه لو) له ژێر کۆنترۆلی هێزه کانی دژ به شۆڕش دا بوو ، ژماره ی چه کداره کانی هێزی رزگاری ته نها (٤٢٢) که س بوو ، وه ته نها حه وت دێ ی له ژێر کۆنترۆڵدا بوو ، به ر له کۆتایی شه ره کان ، ژماره ی هێزی رزگاری گه یشته (٣٠٠٠) که س، جگه له وه ش هه موو ئه و شوێنانه ی که له لایه ن هێزی خه باته وه له ده ست درابوون ، جارێکی دیکه له لایه ن هێزی رزگاری و چه ند هێزێکی تر ئازادکرانه وه ، وه به م جۆره ش ناوچه ی کۆیسنجق، خه له کان ، شوان ، قه لاسیوکه ، قه ره داغ و ئالتون کۆپری تا ده گاته قه زای کفری و که لار ئازاد کران . دوای به یاننامه ی ئازاریش ، بۆ هه موو لایه ك دیاره ، ئه مجاره ش وه ك دانوستاندنه کانی رابردوو ، ده مبینی له خزمه تی گه ل و حزبه که م دوور خراومه ته وه .

سه ره رای ئه وه ی که تووشی هاتووم ، کارناکاته سه ر وه زعه که م و ره وتی تێکۆشانم و باوه رم به کێشه ی گه له که م و سه رکردایه تی شۆڕش ، هه ر ده گه ڕێمه وه بۆ کاره کانم ، بۆ خزمه ت کردنی گه‌له که م ، به فه خرو لێبوردویی و بێ گوێ دانه رۆژانی رابردووی پڕ له مه ینه ت و ده رده سه ری .. ویژدانم پاکه و ئاسووده یه .

هیوادارم وابیرنه که یته وه که قسه کانم پیاهه ڵدانه به خۆم ، به ڵکو به پێویستم زانی له هه ندێك راستی ئاگادارت بکه مه وه بۆ ئه وه ی دڵنیا بی.

هه ربژین وه ك برایه کی خۆشه ویست و کارامه .

برای هه میشه یت

فاخر

# فاخر مەرگە سوری

# شهيد النقاء الثوري *

فاخر مه رگه‌سوری غني عن التعريف. ولكن لفائدة قراء الغد من الشباب او الذين لم يواكبوا الاحداث التي سبقت عام ١٩٧٥ نقدم هذه السطور:

هو ابن حمه مه‌رگه‌سوری رئيس احدى العشائر البارزانية، واحد ابرز قادة الحركات الوطنية ضد الحكومات العراقية المتعاقبة، وقد انسحب مع غيره من الثوار الى الاتحاد السوفيتي عام ١٩٤٥** بعد فشل الحركة البارزانية في ذلك العام وعاد للعراق عام ١٩٥٨ بعد ثورة ١٤ تموز الوطنية.

وخلال ذلك ظل فاخر صبيا مشردا في العراق يعاني ماعاناه البارزانيون واخوانه وابناء الشعب الكردي الاخرون. فانضم في صباه الى صفوف الحزب الشيوعي العراقي واظهر شجاعة واستخفافا بارهاب الحكم الملكي فتعرض لاكثر من مرة للسجن كما يذكر في رسالته التي ننشرها هنا. ولعب فاخر دورا بارزا في قمع تمرد رشيد لولان الرجعي عام ١٩٥٨ـ١٩٥٩ وانضم الى صفوف الحركة الكردية المسلحة واصبح احد قادتها البارزين. وعندما انبثقت القيادة المركزية للحزب الشيوعي العراقي كان فاخر واكثر اخوانه ووالده من مؤيديها القريبين.

لكنه آثر العمل في صفوف الحزب الديمقراطي الكردستاني. وقد شاءت التقلبات التي مرت بها الحركة الكردية ان عزلت فاخر واخوانه واقاربه عن صفوف الثوره. ثم نفذ بهم حكم الموت اثناء الانسحاب الذي فرض على الحركة نتيجة اتفاقية ٦اذار ١٩٧٥ بين صدام التكريتي والشاه المخلوع.

## وثيقة بخط البطل

ان المصاعب التي مر بها الشعب الكردي كانت من الجسامة بحيث لونت كل شيء في حياته وتراثه، وعلى قدر التحدي يكون العطاء. ومن هنا كان تاريخ هذا الشعب وطيسا نضجت فيه روح البطولة على الصعيدين الفردي والجماعي. حتى غدت جبال كردستان رمزا لعشاق الحرية في منطقة من العالم كانت ولاتزال ميدانا لخيل الغزاة من كل

* الغد ٩ آذار ١٩٨١

** حه‌مه‌د ئاغای مێرگه‌سوری نه‌چۆته یه‌کێتی سۆڤیه‌ت

حدب وصوب.. وتتوسط هذا السجل الحافل بالمآثر الاسطورية صورة شفقية الالوان للبطل فاخر مرگسوری ووالده واخوانه.

سوف يرسم فاخر بنفسه جانبا من هذه الصوره ، لكننا نضيف ، وقد عايشناه جانبا اخر : هو حد النهاية البطولية التي اختارها القائد بنفسه ولاهله.. لقد فضل فاخر ان يموت، وكان بمقدوره ان يعيش لئلا يلطخ تأريخ شعبه بلوثة خيانة، او مساومة.. او تراجع.. ففي مجرى العلاقات العشائرية التي ظلت تسود المجتمع الكردي حتى العصر الحاضر، وجد فاخر امام خيار صعب : الموت بايدي كردية، او الحياة مع الفاشيين العنصريين اعداء الشعب الكردي. ولم يكن لديه خيار ثالث امام الاوضاع القائمة أنذاك، فالتمرد على القيادات التقليدية مع التأييد الشامل الذي كانت تحظى به لم يكن ليفهم الا على انه طعنة في ظهر الشعب وتفتيت لنضاله التحرري في الوقت كان العدو يستعد فيه للمعركة الفاصلة.. وقد وازن فاخر واهله بين الخيارين واستشاروا اصدقاء المحنة ورفاق السلاح فأختاروا اشرف الطريقين ، مدركين في عين الوقت انهم سيكونون، رغم هذا القرار البطولي، موضع اتهامات باطلة تحاك لتبرير المسئولين عن دمائهم.

اننا اذ ننشر هذه الوثيقة ،وهي رسالة كتبها فاخر لاحد خلصائه نرى لزما علينا ان نذكر اننا نتحمل مع جميع الغيارى على مصير كردستان وعواقب ذلك الخيار.. فان كان في ذلك شيء من الحيف فنحن لا نبرأ من العهدة فيه ،وأن كان ما فعله فاخر واخوته وابوهم الشيخ واطفالهم الذين قتلوا معهم جميعا هو الصواب فمن اقل ما يجب على الجميع ان يتجاوزوا عقبات التكتيك وفروض المجاملة ليؤكدوا وفائهم للابطال ، وان يتعهدوا ذكراهم لئلا يلفهم ستار النسيان.. وكيف لاوهم صفوة كردستان وخلاصة تأريخها الدامي؟

***

حاجي عمران

١٩٧١/٦/٨

اخي وعزيزي ..... المحترم

بعد التحية والصدق

استلمت رسالتكم الجميله التي كانت تحتوي ارق وانبل مشاعر الود

والمحبة تجاهي اشكر شعوركم النبيل وارجو من الله ان يحفظكم ويريحكم من كل مكروه.

اخي: الحياة كفاح، وطريق الكفاح وعر وشائك ومليئة بالصعاب والالام، ولكن ليس هناك قوة ومناعة تستطيع الوقوف امام جبروت وتصميم المخلصين والمكافحين من اجل قضية شعبهم وامتهم. وان ما تعرضت لها ليس بشيء جديد بل تأريخ الشعوب والثورات كنز من امثال ما تعرضت اليها، ولكن النصر هو حليف الصدق، والاخلاص عاجلا ام اجلا.

اخي: في ١٩٥٠ دخلت في معمعة الصراع السياسي، تعرضت عدة مرات للسجن، والاعتقال ولطاردة رجال الامن والبوليس، وتعرضت مرات عديدة لاصعب لحظات البؤس والفقر والمخاطر ولكن تصميمي وثقتي بنفسي جعل الاعداء ان يعجزوا بكل اساليبهم، ثق يا اخي بانني لم اتذكر يوما هادئا من حياتي، بل اصبحت المشاكل من اقرب المقربين الي وصديق دائم ولئيم، ولكن ارادتي واخلاصي للشعب والثوره وقيادتها اقوى من هذا الصديق....

في مفاوضات ١٩٦٤ تم ابعادي من گلاله الى رانيه لمدة ٣٦ يوما دون اي مبرر، في مفاوضات ١٩٦٦ بعد معركة هندرين تم تجميدي خلال ٩ اشهر دون عمل، وفي سنة ١٩٦٧ تم تجميدي خلال سبعة اشهر. ثم في شهر ١٩٦٧/١٠ عاودت عملي العسكري بناء على امر قائد الثورة. وبعد اعادة سيطرتي على منطقه بهمو في ١٩٦٨ جمد نشاطي من جديد الى شهر ١٩٦٩/١ . ثم تم تكليفي للقيام بضرب شركة النفط فنفذت الواجب بامانة. ثم تم عزلي عن العمل الى شهر ١٩٦٩/٤، في ١٩٦٩/٤/١٧ كلفني قائد الثورة ان نهاجم مدينة قلعة دزه وفي ١٩٦٩/٥/٢٢ تم تحرير قلعة دزه وكانت اول مدينة كردية تحت سيطرة الثورة ثم توجهنا الى هيز خبات، في ١٩٦٩/٤/١٢ لنجدة هيز خه بات بعد استشهاد البطل عزيز اتروشي، وبعد مساهمة فعالة في اعادة الاراضي والقرى والمواقع التي خسرها هيز خه بات.

صدر امر من قائد الثورة بتعيني آمر هيز رزگاري، تسلمت مسؤوليتي الجديده حين كان مقر الهيز (سرگلو) تحت سيطره القوات المعادية للثورة، وكانت قوة هيز رزگارى ٤٤٢ مقاتل فقط وكان تحت

سيطرة الهيز سبعة قرى فقط ، ثم وصل تعداد قوة رزكاري ٣٠٠٠ مقاتل في اواخر القتال، بالاضافة الى تحرير جميع الاراضي التي فقدتها الثورة على يد هيز رزگارى وبعض قوات اخرى وبذلك تم تحرير منطقة كويسنجق ، خلكان، وشوان ، وقلاسيوكه وقرداغ من التون كوپرى الى قضاء كفرى وكلار.

وبعد بيان ١١ اذار معروف لدى الجميع ، وها تشاهدني اليوم كما كان في مفاوضات اخرى محروم من خدمة شعبي وحزبي ، ولكن كل ما تعرضت له لايؤثر على وضعي ومسيرتي وايماني بقضية شعبي وقيادة الثورة ، سوف اعود الى العمل واخدم شعبي بكل فخر زنكران ذات دون الاهتمام بماضي المليء بالمآسي والالام. ولكن ضميري مرتاح ونقي.

ارجو ان لاتتصور بانني امدح نفسي ، بل رأيت لزاما علي ان ازودكم ببعض الحقائق لكي تطمئن.

دمتم اخا بكل عز ومجد

اخوكم الابدي

فاخر

ئه‌گه‌ر هاتوو جه‌وهه‌ر ئاغا کوڕی حه‌مه‌دئاغا ، وه‌ك روناکبیرێك و نوسه‌رێك رووداوه‌کانی بنه‌ماڵه‌ی خۆی له‌دوای ساڵی ١٩٧٢ وه تاقه‌تل و عام کردنیان یادداشتی نه‌کردبایه زۆر لایه‌نی ئه‌م تاوانه گه‌وره‌یه ئاشکرا نه‌بونایه . گرنگترینیان ئه‌و ده‌فته‌ره بچوکه‌یه‌که سێ رۆژ به‌رله‌گولله‌باران کردنی جه‌وهه‌ر ئاغاو براکانی له‌به‌ندیخانه نوسیویه‌تی و له‌دوای ئیعدام کردنی له‌گیرفانی دۆزراوه‌ته‌وه، بنه‌ماڵه‌که‌یان لای خۆیان پاراستیویانه و یه‌ك دووکۆپیشی ناردراوه‌ته ئه‌ولاو ئه‌م‌لاو بۆ ئه‌وه‌ی له‌فه‌وتان رزگاربێ ئه‌م به‌شه‌ی که‌له‌ژێر ناونیشانی دیسان به‌ندیخانه نوسیویه‌تی . به‌ڵگه‌یه‌کی جه‌شاهه‌ڵ ئه‌گره له‌مه‌ڕ دواسێ رۆژی ژیانی جه‌وهه‌رو باوکی و هه‌ندێك له‌براکانی له‌به‌ندیخانه‌ی رایات‌دا . بێ ئه‌وه‌ی هیچ ده‌ستکاری نوسینه‌کانی کاك جه‌وهه‌ر بکه‌ین له‌رووی ئیملاو نوسیندا به‌سه‌رهاتی ئه‌م سێ رۆژه وه‌کو خۆی ده‌خه‌ینه به‌رچاوی خوێنه‌رانه‌وه .

## دیسان به‌ندیخانه* :

## ٢٠ ئازار

ئه‌مرۆ کارۆخی کوڕم نه‌ساغ بوو ، بردم بۆ خه‌سته‌خانه‌ی (که‌وه‌رتێ) به‌لام سه‌یر ئه‌وه‌بوو خه‌سته‌خانه چۆڵ و هۆڵ بوو . ده‌رگاکان داخرابوون . دوای پرسیار توشی برین پێچێك بوم – چوین بۆ ده‌رمان خانه به‌لام به‌داخه‌وه برین پێچ هیچی له‌هیچ ده‌رنه‌ده‌کردو واده‌رکه‌وت که ده‌بی به‌شه‌ر بگه‌رێته‌وه زه‌مانی کۆن که مرۆڤ به‌بۆن شتی ئه‌دۆزیه‌وه . برین پێچ که‌وته بۆنکردنی ده‌رمانه‌کان منیش به‌چاوێکی بێزه‌وه سه‌یرم ده‌کرد –

به‌هه‌ر حاڵ جۆره ده‌رمانێکی شلی دۆزیه‌وه به‌بۆن و گوتی لام وایه ئه‌مه باشه بۆ (فتق) ، منیش گوتم ده‌ساقورمان به‌سه‌ر له‌وهه‌موو

---

* دیسان به‌ندیخانه : ده‌قی نووسینه‌که به‌خه‌تی جوهر ئیرگه سۆری له‌گه‌ڵ دیکیۆمێنته‌کان و وێنه‌کاندا بلاوکراوه‌ته‌وه .

دکتۆرانە تۆمان بۆبمێنێ کە بەبۆن تشخیصی . نەخۆشی دەرمان دەکەن ، گوتم : براگیان زۆر زۆر سوپاس منیش خۆم بەبۆن کردن دەکەم بە دکتۆر ...

گەرامەوە بەبێ ئەوەی هیچ علاجێك بۆ ئەم مندالە بکرێت ، وەلەرێگای گەرانەوەم توشی (حمه علی چوار کلاوی بووم) کە(پ.م)بوو لەبەتالیونی ٢ زۆزك سوارم کردو گوتم :

هاکاك حمه علی بۆ بێ چەکیت گوتی : جەبهەکان لەغوکران ، گوتم چیتر : گوتی ، دوێنێ علی خلیل کە ئامر هێزی تازەی بالەکە بەئێمەی گوت : بابم شەر نەماو جەبهە نەما هەر کەس ئازادە بروات بۆ میری یان بڕوات بۆ ئێران .

وەحمەعلی گوتی منیش چەکەکەم تسلیم مەشجەب کردو گەرامەوە .

ئێمە گەیشتینە ئازادی مەحمود و نزاری براشم لەگەڵ دابون ، لەسەر رێگای خەلان خەلکێکی زۆر وەستابوو وەشێخی خەلان (شیخ عبد الله) و عبد القادری برایشی لەگەڵ دا وەستابوون منیش دابەزیم و جەماعەت بەپیرمەوە هاتن و گوتیان چاوت رۆن ... کاك فاخیرو جەماعەت بەرەللاکران . و ئێستا ئێمە دیمان بەسەیارە لێرەدا بەرەو رایات رەت بوون وەهەروەها گوتیان پێش نیوەرو هاتنە شوێن باوکیشت بردیان بۆ لای بارزانی ... گوتم خێرە انشاء الله بەلام دلم نەپشکوت .

گەیشتمەوە خەلان سەیرم کرد ماڵی ئێمەو خەلکی ئاوایی گشتیان چاوەروانی گەرانەوەی بەندیەکان دەکەن .

سیارەم وەستاندو چومە مالەوە توشی ژانە سەرهاتم . چاییکم خواردەوە .. بیرم لەوە دەکردەوە کە باوکم بەتەنهایەو نەساغیشە بۆیە بریارم دا هەر چۆن بێت بگەمە خزمەتی ئەگەر لە بەندیخانەش بێت .

وەیەکسەر محمودی عبد للە بەگم لەگەڵ خۆم برد ، چوم بۆ ئیدارەی بەندیخانەی خەلان و بەخالد ئاژەگەیم گوت کە تەلیفۆن بکات داخوا باوکم لەکوێیە . وەئێمە خەریکی تەلیفون بوین کە (کەریم سنجاری) وەدەرکەوت وادیاربوو هاتبووە شوێن من ... وەبەرلەوەی ئەو باس بکات من داوام لێ کرد کەدەمەوێ بچمە لای

باوکم ــ گوتی باشه به یه که وه ده چین .
ده وری سه عات ٥,٥ ئیواره سواری سیاره ی ئه وبوم . دیاربو گوتی با محمود نه ییت چونکه ته نها مسعود ئه مری کردوه تۆبێیت ، الحاحم کرد که محمودیش بێت ــ دیاربونه ده ویرا رێگا بدات بێت ، وه من زانیم بۆ حه پسه گه یشتبێنه ئازادی من له و باوه ره دابوم که ئه چین بۆ حاجی ئومه ران ــ به لام دیاربوو به ره و خواره وه بای داوه ــ زانیم بۆ حه بسی راپاته .
وه نزیك مغرب له حه وشه ی سجن چوینه ژوره وه ، من له ژوری حه ره سه کان دانیشتم و کریم سنجاریش چوه لای مام سعید مصیفی ، پاش ماوه یه ك رۆیشت و مام سعید ناردیه دوام . له ده رجه کان سه رکه وتم هه لبه ت ئه مه سێ یه مین جار بو من له ی سجنه حه بس ده کرێم له سه ر ده ره جه کان توشی مام سعید بوم تۆقه یه کمان کردو پێم گوت سه رێکم لێ بده گوتی باشه .
وه ئامر حه ره س که ناوی صدیق بو پێشم که وت بۆ نهۆمی سێهه م که له ئه ساس ده رگای سه رکه وتنی سجن بو به لام وادیاربو دیواریان بۆ کردبو کردیان بوبه ژورێکی بچوك حه ره س تێدا ئه نوستن . دیم ژوره که سێ قه لیوره ی تێدایه پیس و پۆخه ڵ و وه ك زبل خانه وابو . تاریك و ره ش فانوسێکی شوشه به دوکه ڵ روناکیه کی پرته قاڵی کزی ئه دایه ژوره که ــ سۆبه یه کی نه وت سوریش له ناوه ند دامه زراندبو .
له سه ر قه لیۆرێك دانیشتم دیاربوو ئامر حه ره سه که زنجیرێکی ئه ستورو دوو قوفلی زل هێناو گوتی ده بێ عاجز نه بیت ئه مره پات زنجیربکه م ... به دوو قوفل زنجیریان به ست و له دڵی خۆم زۆر ناره حه ت بووم ، چونکه ئه مه کارێکی بێ مانابوو ، وه زعی شۆرش له وه نه مابوو ئومیدێکمان هه بێت . هه مووی ٩ رۆژ مابو که سوپا ناوچه که احتلال بکات و به جۆرێکی رۆتین هه مو حه پسێك به رده دری له وه ش زیاتر من که له ده ره وه بووم ئازادبووم و رێگاشم لێ دیار بوو ئه گه ر نیازی چونم بوا ئه چوم به لام ممکین نی یه من خیانه ت بکه م وبچمه ناو دوژمن .
مع العلم رێگا کرابووه وه ، وه به چاوی خۆم ئه م دی کۆمه ل کۆمه ڵ پێشمه رگه و خه ڵك به جاده دا ئه چون بۆخۆتە سلیم کردن ، معنویات نه مابو . خه ڵك ئومیدی به شۆرش برابو .

به هه ڕحال تاسره نگ له گه ڵ حه ره سه کان رام بواردو له زۆر بابه ت قسه مان کرد ، ده وری سه عات ١١ ی شه وخه وتم .

## ٢١ ئازار (١ نه وروز)

ئه مرۆ سه عات ٧,٥ هه لسامه وه له خه و حه ره سه کان له ژورنه مابون وه تاسره نگ به لکو تانیوه رۆ نه یان بردمه ده ره وه چونکه زۆربه ی حه پسه کان که له ٢٠٠ که س زیاتر بون له ناو حه وشی سجن بون .

مه منوعیشه که س من ببینی .

چایه که م چاك کردو هه ندێ ماستیان بۆ هێنابوم خواردم .

ده وری سه عات ١٠ حه ره سێك هات گوتی واخه ریکن چه کی حه ره سه کان گلیر ده که نه وه و ئه مرۆ زۆر حه پس به رده درێن وه هه رواش بو .. له ده وری سه عات ١٠,٥ به یانی دیاربو مام سعید به قائمه یه که وه هاته حه وش و حه پسه کانیان خر کردنه وه و ده ستیان کرد به ناو خوێندن .. هه ر که ناوێکی ئه خوێنده وه ده بوایه خاوه نه که به ده نگی به رز وه ڵام داته وه ..

ــ فلان کوری فلان ...

به ڵێ ... یان نعم ...

هه موو حه بسه کان به چاوی ئومێده وه پاڵه په ستۆی یه کتریان ده کرد بۆ نزیك بونه وه له مام سعید و هه ریه که به ته مای ناوی خۆی بو ...

نزیکه ی ٥٠ ناوێك خوێندراوه وه بڵاوه کرا .

وه له ناو قه له بالغی حه پسه کان چاوم به(علی حسن) دیانه یی که وت که پێشمه رگه بو لای ئێمه و له ساڵی ١٩٧٢ له سه رئێمه حه پس کرابو .. وه هه روه ها (سعید گه ردی) که ئه ویش له گه ڵ من له ١٩٧١ مانگرته مموزگیراو هه رمابو تا ئێستا ره نگیان زه ردو لاوازو کزبون ، به لام ئومێدیان هه بوو به ربین به داخه وه ناویان له یه که م قائمه دا نه بو.

وه‌دوای ئه‌وه‌ی حه‌پسه‌كان به‌ردران بۆ سه‌رئاودیم جه‌ماعه‌تی ئێمه‌ وه‌جبه‌ی یه‌كه‌م (صدیق مامكك)و (سعید جاسر) هاتنه‌وه‌ ، چونه‌ سه‌ر ئاوو گه‌رانه‌وه‌ ، به‌لام زنرۆكه‌ چه‌لیان له‌گه‌ڵ نه‌بو كه‌له‌ ژوری ئه‌وان بوو وادیاره‌ به‌ره‌للاكراوه‌ .

ئه‌وان چونه‌ ژووره‌وه‌و وه‌جبه‌ی دوهه‌م ده‌رچون هه‌رجماعه‌تی ئێمه‌ ، سوارغاو رشیدواسعدو خلیل ومجید و فرامرزو قادر كریم قادر ئه‌رگوشی.چونه‌ سه‌رئاو خۆیان گورج كردبووه‌وه‌ رووخۆش و بێ غه‌م به‌ئومێدی به‌ربون بوون ، به‌لام به‌داخه‌وه‌ دوای ماوه‌یه‌كی باش كه‌چونه‌ ژوره‌وه‌ ، له‌بیره‌ خه‌و راچوبوم گوێم له‌قه‌له‌بالغ بو كه‌م كه‌م ده‌نگ زیاد بو ... وه‌گوێم له‌قیره‌و هاواری اسعدی برام بو ده‌نگم ناسی ته‌نگاو بوم ، بوه‌بگره‌و به‌رده‌ .. قه‌له‌بالغی كه‌وته‌ناو حه‌وشی سجن و خۆم له‌ سه‌رزگ درێژ كردو له‌ كونێكه‌وه‌ ته‌ماشام كرد .. دیم رشیدی برام زنجیركراوه‌و قادر خه‌ریكه‌ به‌دوویه‌ر قوفله‌كان بشكێنێ بۆی نه‌شكا .

ناچار بوم به‌پێ ی به‌زنجیره‌وه‌ گوپال به‌ده‌ست له‌ده‌ره‌جه‌كان دابه‌زیم و دیم ١٥ ـ ٢٠ حه‌ره‌س به‌هه‌موو جۆره‌ چه‌ك سه‌ربان و پێشه‌وه‌یان گرتووه‌و ده‌ستیان له‌سه‌ر پلاپیتكه‌ی چه‌كبو .

گه‌یشتمه‌ ده‌رگاو ئه‌وبه‌زمه‌م دی گه‌یشتمه‌ قه‌ناعه‌ت كه‌خه‌ریكن یه‌ك یه‌ك بمان كوژن ... بویه‌ به‌په‌له‌ ده‌رپه‌ریمه‌ده‌ره‌وه‌، دیتم خه‌لیل و رشید واسعد پشتێنی مام سعیدیان گرتووه‌و ئه‌ویش له‌ناویان ته‌نگاو بووه‌و ره‌نگ زه‌ردو بانگی كردم كاك جوهر ئه‌مه‌ خاله‌ علاجێك بكه‌وه‌ یه‌كسه‌ر زنجیرم له‌سه‌رپی ده‌رهێناو قاچم ئازادبون ... داوامان كرد له‌مام سعید ئۆبالی كوشتنی ئێمه‌ نه‌گرێته‌ ئه‌ستۆ ... وه‌له‌گه‌ڵ ئێمه‌ بیت بۆ باره‌گای بارزانی و گوتمان بائه‌وان بمان كوژن .. یان لێمان گه‌رێ به‌خۆمان ئه‌چینه‌ ئه‌وێ .

به‌و حاله‌ سه‌د جار ئه‌و سه‌رو ئه‌وسه‌ری حه‌وشه‌مان كردو هه‌موومان له‌خۆمان بێ ئومێد ببوین چونكه‌ قه‌ناعه‌تمان كرد . فاخر و سعید كوژراون وه‌دوای دووسه‌عات له‌و بگره‌و به‌رده‌و حه‌ره‌سه‌كان ته‌قه‌یان به‌ئاسمانه‌وه‌كرد .

پاشان مام سعید ده‌ستی به‌قورئان دادا كه‌ قه‌زیه‌كوشتن نیه‌و وه‌عدی شه‌ره‌فی دا كه‌ فاخر و سعید سه‌لامه‌تن و قه‌زیه‌ش به‌و

جۆره نیه که ئیمه بیستومانه .. وه‌وه عه‌دیشی دا که ئه‌م باسه له ناوخۆمان ده‌رنه چێت.
به هه‌رحاڵ نه‌مان توانی پارچه چه‌کێك بخه‌ینه ده‌ست و چوینه ژووره‌وه دوای ئه‌وه‌ی نه‌مان هێشت زنجیریکه‌نه پێمان و سعیدو صدیق که‌له ژوورێکی تربوون له‌گه‌ڵ من که‌به‌ته‌نها بووین له یه‌ك ژوور هه‌موومان خربووینه‌وه .

## ۲۲ ئازار :

ئه‌مرۆ دوای نیوه‌رۆ له‌ناکاو گوێمان له‌ده‌نگی خێزانی خۆمان بوو که هاتبوونه بن دیواری سجن و هه‌مووییان به‌یه‌ك جار قیراندیان به‌سه‌ر حه‌ره‌سه‌کان (ماڵی ئیمه‌تان خراپ کرد ، ماڵی ئیمه‌تان خراپ کرد ماڵی کوردتان ویران کرد شۆرشتان روخان قورتان به‌سه‌ری ئیمه کرد تا که‌ی ئه‌م زوڵمه ...)
پاشان بێ ده‌نگ بون و دیاربوو بۆلای مام سعید چون ...
دوای سه عاتێك دیاربو عبد المهیمن کوری شێخ سلیمان هات له‌گه‌ڵ ئازاد به‌رواری چونه ئیداره . زۆری نه‌برد ئازاد هات له‌کونی ده‌رگا هه‌ندێ ناوی خوێندنه‌وه گوتی :
سوارغا ، فرامرز، صدیق مامکك ، سعید جادر ، قادرکه‌ریم . قادر ئه‌رگوشی، خۆتان حازر که‌ن به‌رده‌بن . هه‌لبه‌ت ئیمه زانیمان به‌ردان نیه و قه‌زیه جیاکردنه‌وه یه.وه ئیمه گه‌یشتینه قه‌ناعه‌ت سه‌دله‌سه‌د ئه‌مان کوژن و ئه‌وه‌ی پێویسته له‌گه‌ڵمان ده‌که‌ن به‌ڵام الحمد الله معنویاتمان زۆر به‌رز بوو چونکه سه‌ربه‌رز بوین به‌رامبه‌ر به میلله‌تی کورد هیچ خیانه‌تێك‌مان نه‌کردووه و تاریخ مان پاکه‌وه دڵنیاشم هه‌رچی به‌سه‌رمان بێت له‌اخلاصی خۆمان بوه . به‌هه‌ر حال له‌و ئه‌سنائه عبد المهیمن سه‌ری به‌کونه‌وه‌ناو که‌وتینه قسه له‌گه‌ڵ ئه‌و وه‌ته‌واوی اخلاصمان بۆ بارزانی عه‌رز کردو گوتمان : ئه‌مرۆ رۆژی مه‌ردو پیاوه وه‌کاتی ئه‌وه‌یه به‌م لێ قه‌ومانه پشتی بارزانی به‌رنه‌ده‌ین و به‌کاملی اخلاصی یارێده‌ی بده‌ین چونکه له‌ته‌نگاو پیاوکه‌مه ناتوانی به‌هیچ جۆر له‌بارزانی جیابینه‌وه مردن و ژیانمان

بە یەکەوە یە .
وە هەر چەندە بە دەقیقە منتنظری ئەوە بووین کە پیاوانی بارزانی یەك یەك دەرمان بکەن و بمان کوژن . بەلام دوای مردنیش ئەلێم :
بژی گەلی کوردمان و مردن و نەمان بۆ خائنانی گەلی کورد کە دائم ئەسپینە یان ئەخستە نێوان ئێمە و بارزانی .
عبد المهیمن هات و گوتی ئەو چە ماعەتە بە ئەمری بارزانی بەردران و ئێوەش بەرەدرێن .. !
هەلبەت ئەم قسەی بۆ دلخۆش کردن کرد .. وە گوتی قسەکانی ئێوە ئەگەینم بە جەنابی بارزانی و ئەمشەو وەلامتان بۆ دێنمەوە ...
بەلام ئێمە قەناعەتی تەواومان هەبو کە ئەمشەو ٢٢\٢٢/٣/١٩٧٥
هەمومان ئەکوژرێن
بژی کوردو کوردستان .
بژی بارزانی ، ئەمری بۆ شەهیدانی کوردو کوردستان
هەلبەت ئێمە تەنها (من و رشیدو اسعد و خلیل و مجید) ماینەوە

• کوردستانی نوێ دوو شەممە ١٣/٢/١٩٩٥ ژمارە ٩١٣

دوای ئاش به تاڵی ١٩٧٥، زیندانیه کانی رایات و خه لان و چۆمان، زۆربه ی زۆریان ئازادکران، ته نانه ت سه یدا صالح یوسفی که گه ڕایه وه، کۆمه ڵێك ئه فسه رو ده ره جه داری عێراقی له گه ڵ خۆیدا برده وه، ته نها ئه و زیندانیانه ی که بێ سه رو شوێن مابوون.حه مه د ئاغای مێرگه سوری و کوره کانی بوون که به ره فتارێکی درندانه و دوور له هه موو ره وشتێکی کوردایه تی و مرۆڤایه تی له ڕۆژی ١٩٧٥/٣/٢٢ قه تل و عام کران.

ژن و منداڵه کانی تاوان لێکراوه کان، بۆ ماوه ی دوو هه فته وێڵ و سه رگه ردان بوون و به دوای ترووسکایی یه ك ده گه ڕان که دوا ئاسۆی مانه وه ی پیاوه کانیانی لێ به ده ر بگه وێ، هیچ کون و قوژبنێك نه ما سه ری پیانه که ن، ده رگای هیچ مه قه رێك نه ما لێ ی نه ده ن، هیچ لێپرسراوێك نه ما لێ ی نه پارێنه وه، به لام بڕیاری مه لا مسته فاو ئیدریسی کوڕی جێ به جێ کرابوو و له کلاو ڕۆژنه شدا ڕووناکی یه ك نه مابوو، که ڕێگای هیوا بۆ ئه و ژن و منداڵ و ژاره ڕووناك بکاته وه.

ئه م دوو هه فته یه ... لاپه ره یه کی تری تراژیدیای قه تل و عام کردنی بنه ماڵه یه کی بێ تاوانه، چونکه پاش راگه یاندنی ئاش به تاڵ له لایه ن خودی مه لا مسته فاوه، که س له و باوه ڕه دا نه بوو که حه مه د ئاغای خاڵی مه لا مسته فاو کوره کانی به م شێوه یه له ناو ببرێن، زۆربه ی زیندانیه کان ئازاد بوون ته نها حه مه د ئاغاو کوره کانی هیچ سۆراخیان نه بوو، ژن و منداڵی ئه و بنه ماڵه یه له گه ڵ شه فه قی به ره به یان تا کازیوه ی ئێواره ببوون به پاسه وانی زیندانی رایات و هه ر چاوێکیان کردبووه ده چاو، بێ دیواری زیندان لێیان وه رس ببوو، به لام چاوه ڕوانی یه کی بێ هوده بوو. بۆیه ناچار له ده رگای که ریم سنجاریان دا، ئه گه رچی سنجاری ئه وساکه ش کاربه ده ستێکی گه وره ی ده زگای پاراستن بوو، له هه موو ورده کاری تاوانه کانی بنه ماڵه به ئاگا بوو به لام پێ ی وتبوون .. «من هیچم به ده ست نیه و بڕۆن نامه یه ك لای مه سعود بارزانی بێنن».

## کلیله‌که لای مه‌لا مسته‌فایه!!

ڕۆژی ١٩٧٥/٣/٢٣، به‌ندیخانه‌ی ڕایات، ئه‌و قه‌لا ترسناکه که ده‌یان که‌سی بێ تاوانی تێدا بێ سه‌رو شوێن کرابوو چۆڵ و هۆڵ بوو، سام و ترسی چارانی نه‌مابوو، ئه‌وه‌ی کوشتیان کوژران و ئه‌وانی تریش به‌ره‌لا کران، دوو له‌پاسه‌وانه‌کانی به‌ندیخانه به‌ژنه‌کانی بنه‌ماله‌ی مێرگه‌سوریان گوتبوو ئیتر خۆتان ماندوو مه‌که‌ن پیاوه‌کانی ئێوه لێره نه‌ماون و به‌ره‌و حاجی ئۆمه‌ران بردران.

«.........»ی شۆفێره‌که‌ی فه‌ره‌نسۆ حه‌ریری، که ئاشنایه‌تی له‌گه‌ڵ فاخردا هه‌بوو، کاتێ ئه‌و ژن و منداڵانه‌ی به‌ڕێکه‌وت له‌نزیک ڕایاته‌وه بۆ حاجی ئۆمه‌رانی هه‌لگرتبوو پێ ی ووتبوون: کلیلی سۆراخ کردنی کێشه‌که‌ی ئێوه لای خودی مه‌لا مسته‌فا ده‌ست ده‌که‌وێ.

## «مه‌سعود قسه‌یه‌ك ده‌کاو باوکی قسه‌یه‌کی تر»

ئه‌و ڕۆژه بنه‌ماڵه‌ی بارزانی خۆیان کۆده‌کرده‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی کوردستان به‌جێ بێڵن و له حاجی ئۆمه‌ران ئاودیو بن. له‌باره‌گای «ئه‌حمه‌د حاجی» ژنه وێڵ و سه‌رگه‌ردانه‌کانی تاوان لێکراوه‌کان پاش یه‌ك شه‌و مانه‌وه هیچیان به‌ده‌ست نه‌که‌وت، «محمد طاهر» ناوێك ده‌چێته لای مه‌سعود بارزانی و داوای لێ ده‌کا قسه‌یه‌ك بۆ ئه‌و ژنانه بکرێ.

مه‌سعودیش بۆ چه‌واشه‌کردن و بزرکردنی سه‌ره‌داوی تاوانه‌که‌یان «فه‌رهادی کوڕی لوقمان»ی برازاکه‌ی ده‌نێرێته لایان و پێ یان ده‌ڵێ: «مامم سلاوتان لێ ده‌کاو، ده‌ڵێ با خۆیان دلته‌نگ نه‌که‌ن و بچنه‌وه، خۆیان کۆبکه‌نه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ ئێمه بێن بۆ ئێران و پیاوه‌کانیشیان سه‌لامه‌تن و لای ئێمه‌ن».

ئه‌وکاته‌ی که مه‌سعود ئه‌و په‌یامه ناراسته‌ی گه‌یانده ئه‌و ژن و منداڵانه، تاوانه‌که ئه‌نجام درابوو. فه‌رمانی باوکی و ئیدریسی برای جێ به‌جێ کردبوو، بۆیه قسه‌که‌ی مه‌سعود ژنه‌کانی له‌دڵه ڕاوکێ و

ترسه وه نه برده ئاقاری یاوه ر پێ کردن و ئارامیه وه ... ڕۆژی ٣/٢٤ ژنه کان جارێکی دیکه ڕێگه ی حاجی ئۆمه رانیان گرته به ر، به لام ئه مجاره دایکی فاخر یه کسه ر ڕوی کرده باره گای مه لا مسته فای بارزانی، ئه و ڕۆژه مه لا مسته فا دوا چاوپێکه وتنی ڕۆژنامه نووسی له خاکی کوردستاندا به ئه نجام ده گه یاندو جاری ئاش به تالی ده دا پاش زیاتر له چوار سه عات «عزت سلیمان به گ ده رگه له یی» به دایکی فاخری ووتبوو مه لا مسته فا ده لێ پیاوه کانی ئێوه م ته سلیم به صلیب الاحمر کردوون و بابچن له وێ وه ریان بگرنه وه دوا قسه ی عزه ت به مانای کۆتایی هاتن بوو به هه وڵ و کۆشش بۆ ئه وه ی به زیندویه تی پیاوه کان بدۆزرێنه وه .

## ( گه ڕان به دوای ته رمه کاندا... )

دوای ئه وه ی بارزانی کوردستانی به جێ هێشت و هێزه کانی حکومه ت نزیک بوونه وه، به ره به ره ته لسمی تاوانه که ده شکاو هێڵه کانی به دیار ده که وتن و ئاشکراتر ده بوو، زۆر خه ڵك هه بوو ئیعدام کردنی ده سته جه معی ئه و بنه ماڵه یان بینی بوو، به لام له ترسی پاراستن و پیاوه کانی باره گای بارزانی نه یان ده وێرا قسه بکه ن.

ئه و ڕۆژه ی که ئه و تاوانه یان ئه نجام داوه، چوار سه عات هاتوچۆی ڕێگای «ده ربه ند ـ رایات» یان گرتووه، یه کێك له و که سانه ی که به دوای کۆکردنه وه ی ئازووقه و پاشماوه ی باره گاکان ده گه ڕا خه ڵکی گوندی «هه سنان» بوو. ئه ی ویستووه ئه م ده رفه ته له ده ست بدات و شتوومه که که ی له ده ست بچێ و وه کو ڕه فیقه کانی بگه ڕێته وه گوندی خه لان، بۆیه خۆی له شوێنێکی نزیك زیندانی رایات مات دابوو ره به چاوی خۆشی بینیبوو چۆن ته رمی چه ند کوژراوێك ده گوازنه وه ته راغ ڕووبارو له وێ ده یان هاوێنه ناو چاڵێك.

ئه وه یان سه ره داوه کانی تریشی کرده وه. سه ره نجام له ١٩٧٥/٤/٢ ته رمه کان دۆزرانه وه و دوا په رده ی تاوانی مه لا مسته فا ده رحه ق به بنه ماڵه ی مێرگه سوری که له ساڵی ١٩٧١ ه وه به زه قی ده ستی پێ کردووه به م شێوه یه ئه م تراجیدیایه کۆتایی هات.

---

• کوردستانی نوێ، سێ شه ممه ١٩٩٦/٥/٣ ژماره ٩٩٨، شالاو مێرگه سوری

نوسەری فەرەنسی رێنێ مۆریس
لەکتێبی (کوردستان یان نەمان)دا کەماموستا جەرجیس فەتحوڵلا لەسالی ١٩٨٦ لەسوید بەزمانی عەرەبی لەچاپی داوە (ل١١٠_١٢١)
دەربارەی شەڕی هەندرێن و فاخیر مێرگەسوری دەنووسێ:
«فاخیر رووخۆش و بەژن و بالابەرز و چوارشانە، ئەوکات برە ردێنێکی بەردابووە و لە (کاسترۆ)ی دەکرد سوێندی خواردبوو کە نەیتاشێ تا سەرکەوتن، فاخیر (وەك نووسەر دەنووسێ) وەك سەرکردەیەکی عەسکەری هەلسوکەوتی دەکردو پلانی هێرش و رزگار کردنی هەندرێنی دانابوو، تا رادەیەك نووسەری «کوردستان یان نەمان» دەڵێ پلانەکەم بۆ یادگار هەلگرتووە لە لاپەرەی ١٣٠_١٢١ دا بلاوکراوەتەوە، نووسەر لەلاپەرە ١١٤ی کتێبەکەیدا فاخیر بەسەرکردەیەکی لێهاتووی کورد ناو دەبات، دیسان نووسەر پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشێ کە فاخیر لە ١٩٦٦/٥/١٨ ریشەکەی تاشی و دوای سەرکەوتن ورزگارکردنی هەندرێن کە داستانی قارەمانیەتی خۆی و پێشمەرگەکانی تۆماریان کرد لە شەڕی ١٢\١١ی ئایاری ١٩٦٦»
چەند لاپەرەیەك لەبیرەوەرییەکانم ١٩٤٩ _ ١٩٩٦
د. جەمشید حەیدەری چاپی یەکەم ستۆکهۆلم ١٩٩٣ ل٧٧_ ٧٨
_ لێرەدا بەپێویستی دەبینم هەندێ بەدوورو درێژی لەم رووداوە بدوێم، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بەخوالێخۆشبوو سەرۆك مستەفا بارزانی و شەهید فاخیر مێرگەسوری.
هێزی بەرگری میللی (کۆمەنیستەکان و هاولایەنەکانیان) لەژێر سەرکردایەتی کاك فاخیر مێرگەسۆری بوون و شەهید جەمال حەیدەریش سەرپەرشتی هێزی کۆمەنیستەکانی دەکرد. مەلا مستەفا بارزانیش هێزی عەشیرەتی بارزان و ئەندامانی پارتی و هەوادارەکانی سەرکردایەتی دەکرد. دوای تێکشکانی شێخ

• بروانە بەڵگەنامەکان

رەشیدی لولان و پەڕینەوەی بۆ ئەودیوی سنوور. مەلا مستەفا فاخیری تاوانبار کردبوو، کە نیازی هەبووە بارزانی بکوژێ بڕیاری کوشتنی فاخیری دابوو. کە ئەو دەنگوباسە دەگاتە حیزبی شیوعی، حیزبی شیوعی ئەوە بە درۆ دەخاتەوە کە فاخیر نیازی ئەوتۆی هەبووبێ . هەروەها شەهید جەمال، دەنێرنە لای سەرۆك بارزانی، چونکە وەك لە پێشتر باسم کرد، ئەو سەرپەرشتی هێزی کۆمەنیستە-کانی دەکرد شەهید جەمال بە مەلا مستەفا ڕادەگەیەنێ کە فاخیر ئەندامێکی حیزبەو بێ ئاگاداری حیزب هیچ هەنگاونانێ و حیزبیش هیچ پلانێکی کوشتنی بارزانی نی یە، بەڵام بارزانی لەسەر گوتەکەی خۆی سووردەبێ و دەڵێ فاخیر بکوژرێ، ئەو بڕیاری مەلا مستەفاو پێ داگرتنی لەسەر کوشتنی فاخیر نێوانی بارزانی و جەمال حەیدەری تێکدەداو فاخیر ناچار دەبێ خۆ بەدەستەوە نەدات و بەنهێنی کاری حیزبی بکات. دوای کودەتای هەشتی شوباتی ١٩٦٣ فاخیر لەگەڵ هاوڕێکانی لەخۆرنەوەزان بنکەی پێشمەرگەی حیزبی شیوعی دەکەنەوە. لە دوای کودەتای ١٩٦٣ .

مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا سەردانێکی مەلا مستەفای کرد، وادەرکەوت کە مامۆستا هەمزە لەگەڵ جەنابی مەلا مستەفا لەبارەی کاك فاخیر دوابوو، بۆێ مانگی تەمموز یاخود ئاب ببو کاك فاخیر لە خۆرنەوەزانەوە گەیشتە ئاوەگرد، وابزانم شەوێك لەوێ ماوەو چوو بۆ لای مەلا مستەفا. مەلا مستەفا نەك لێی بووردبوو بەڵکو کلاشینکۆفێکیشی بەدیاری دابوێ، پاشان کاك فاخیر لەلایەن حیزبەوە بۆ ناوچەی گەڵالە ڕەوانە کرا. تا شەڕی هەندرێن فاخیر ئەندامی پارتی کۆمەنیستی عیراق بوو کەبیستوومە دوای ١٧ی ئەیلولی ١٩٦٧ (کە بەشێك لە ئەندام و کادیرانی حیزبی کۆمەنیستی عیراق لە حیزب جیا بوونەوە). کاك فاخیریش هەواداری ئەو گروپە بوو. نێوان کاك فاخیرو حیزب تێکچووە پاشان کاك فاخیر دەگەڵ پارتی کەوت کاك فاخیرم لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز ناسی، ئەوسا ئەو کۆمەنیست بوو، منیش لەگەڵ پارتی دیموکرات دا بووم. دێتە یادم چەند جارێك من و کاك فاخیرو شێخ لەتیف بەرزنجی پێکەوە سەردانی هەندێ ناوچەمان دەدا بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی جوتیاران.

کاکه فاخیر مرۆڤێکی تێگه یشتوو، قسه خۆش و خوێنده وار بوو. ده ستی ره سمکردنیشی هه بوو، جگه له وه ی ئه وانـــــــه ی له پێشمه رگایه تی له گه ڵ کاك فاخیر بوون باسی ئازایشیان ده کرد.
کاك فاخیر له کۆنگره ی هه شته مدا گه یشته ئه ندامه تی کۆمیته ی ناوه ندی پارتی و پاشان به رپرسیاری سلێمانی پێ درا، پاشان له لایه ن شۆرشه وه گیرا، ئێستاش پارتی هیچ به ڵگه یه کی له م باره وه بلاو نه کردۆته وه، ئه وه ی شایانی باسه حه مه د ئاغای مێرگه-سوری وابزانم خاڵی مه لا مسته فابوو*. له ساڵی ۱۹٦۳ به رپرسیار بوو له کانی گیزێ و له کاتی رژێمی پاشایه تیشدا حوکمی ئیعدام درابوو. (حه مه ن ئاغا باوکی فاخیره) پاشان هه موو بنه ماڵه ی حه مه دئاغا نه لایه ن شۆرشی کورده وه گیران. شایانی باسه ۱۹٦۳ تا (حوسێن)ی برای فاخیری نه کوژرا به عس نه یتوانی بارزان بگرێ، له و رۆژانه دا، گۆڤاری «خه رمانه» ی ژماره ٤ ی ساڵی ۱۹۹۲ چاوپێکه وتنێکی له گه ڵ مامۆستا جه رجیس فه تحوللا بلاو کردۆته وه، مامۆستا جه رجیس فاخیر به وه تاوانبار ده کات که پیاوی به عس بوو بۆیـه گیراو له لایه ن شێخ محمد خالید (کوری شێخ ئه حمه دی بارزان) ه وه کوژرا.
مامۆستا جه رجیس ،هیچ به ڵگه نادا، به ڵکو ته نیا ده ڵێ به ڵگه هه یه!
لێره دا پرسیارێك دێته کایه وه، ئه گه ر به ڵگه هه یه ده رباره ی فاخیر ئه دی ساڵی ۱۹۷٥ حه مه د ئاغا وره شید و سه عید و مه جید و کوره کانی تری بۆ کوژران؟ ئه وانیش پیاوی به عس بوون؟
به بروای من ئه و قسانه جێی گومانن.

---

* له راستیدا حه مه د ئاغای مێرگه سۆری ، باوکی فاخر خاڵی مه لا مسته فای بارزانی نی یه، به ڵکو خزمایه تیه که یان به م جۆره یه :

باپیری حه مه د ئاغای مێرگه سۆری ناوی حه مه د ئاغا بووه، ئه ویش برایه کی هه بووه ناوی سلطان ئاغا، کوری سلطان ئاغا ناوی ئه حمه د ئاغا بێرسیاوی ـ یه ، که پیاوێکی به د: سه لات بووه و پشت وقه وه تی شێخه کانی بارزان بووه و کوری نه بووه.
ئه حمه د ئاغا خۆی و عه شیره ته که ی (شێروانی) ،له هه موو شه ره کانی بارزانی یه کان و عه شیره ته کانی ده وروبه ردا، به رگری له شێخه کانی بارزانی کردووه.
خوشکه که ی ناوی (خاتوون) بوو، داوه ته باوکی مه لا مسته فا ، شێخ محمدی بارزانی . کچه که شی (محبوب) داوه ته مه لا مسته فا ، (محبوبه) دایکی عبیدالله بوو. به وخزمایه تی یه ، مه لا مسته فاو ماڵی بارزانی به حه مه د ئاغایان ده گووت (خاڵ).

# سێ ساڵ خەبات و وڵاتێکی وێران

**١٩٦١_ ١٩٩٠**
**سوێد/١٩٩٠**

**کرمانج گوندی (کەریمی سعید مصیفی) ل٥٨ _ ٥٩**

سەرکردایەتی شۆڕش ،هەربەوەش نەوەستا و لە کوشتنی خەباتگێرانی پارچەکانی دیش کەمتەرخەمی نەدەکرد .

(سەعید ئاڵچی) ئەندامی سەرکردایەتی ی پارتی دیموکراتی پێشڤەڕۆی کوردستانی بندەستی تورکیا... ئەمانە هەموویان لەناو سنووری دەسەلاتی شۆڕش هاتنە شەهید کردن.

لە لایەکی دی. کوشتاری بەکۆمەڵی خێزانی (حەمەد ئاغای مێرگەسوری). حەمەد ئاغا، لەکاتێ کە کوژرا، ئیختیارێکی پتر لە شێست ساڵان بوو، لەگەڵ کورەکانی و برازایەکی ، ٢_٣ ڕۆژ پێش ئەوەی سەرکردایەتیی ئاوای ئێران بێ، کوژران، (فاخیرو سەعید)ی برای لە ساڵی ١٩٧٢ دا، هەر پاش گەڕانەوەی سەعید لە بەغدا، گیران و پێکەوە کوژران، جا ئەگەر فاخیرو سەعید گوناهباربوون، حەمەد ئاغاو کوڕەکانی دی گوناهیان چی بوو؟!

ئەگەر حەمەد ئاغاش گوناهی هەبوو، (جەوهەر)ی کوڕی، کەهەتا گوللە ساردی کردەوە، بانگی ڕاهێشت (بژی کوردستان، بژی مەلا مستەفای بارزانی، بژی سەرکردایەتی ڕاو یاریی ی شۆڕش) تاوانی چی بوو؟!!!!

ئەگەر ئەم ژێنۆسیدە، کینەوەرێکی خێڵەکی و دوژمنایەتیەکی کۆن بوو، بۆچی دەبوا لەژێر ناوی ڕێبەرایەتی بزاڤی ئازادیخوازانەی نەتەوایەتی ئەنجام بدرێ؟!! ئەگەر کوشتارەکە خێڵەکی بوو، خۆ فاخیر ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی و یەکێك لە فەرماندەی هێزەکانی شۆڕش بوو، کەواتە گەلی کورد مافی ئەوەی هەبوو، بزانێ یەکێك لەڕێبەرەکانی بەتاوانی چی ئەوها هاتە کوشتن!!! ئەم کردەوانەی سەرکردایەتی شۆڕش ، بۆ خۆی بڵاوکردنەوەی تۆوی بێهومێدی لەناو جەماوەرو دوورکەوتنەوە لە ڕێبازی شۆڕش و هێڵی جەماوەری بوو.

# بارزان و ڕەچەڵەکی بارزانیان

# لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی ومێژوویی لەسەر بارزان تا بەهاری ١٩٧٤

**مامخان شێروانی**

**لاپەڕە (١٣٧_ ١٤٠) ١٩٩٤ لندن**

**ناکۆکی لە نێوان مەلا مستەفاو کورە خانەکانیدا :_ .**

_ حەمەد ئاغای مێرگەسۆری خاڵی مەلا مستەفا، یەکێ لە پیاوە ناودارەکانی تیرەی شێروانی بوو، لەڕووداوەکانی ناوچەکە ڕۆڵی دیاری هەبوو، بەتایبەتی لەڕووداوەکانی شەڕی خێڵی بارزانیان لەگەڵ خێڵەکی تر، هەروەها نائارامیەکەی (١٩٣١_١٩٣٢) وڕاپەڕینی ١٩٤٣_١٩٤٥ی بارزانیان، کورەکانیشی لە ڕۆشنبیرە بەدەگمەن هەلکەوتووەکانی ناوچەکە بوون، بەتایبەتی فاخیریان هەڵوێست و کەسایەتی فاخیر، ئەوەدەهێنێ بەوردی لێی بکۆڵدرێتەوە، ئێمە لێرەدا تەنیا بایەخ بەلایەنێکی ئەو کەسایەتیە ئەدەین.. فاخیر پیاوێکی ڕۆشنبیرو خوێندەوار بوو بیرو بۆچوونی هاوچەرخ و پێشکەوتوو خوازانەی هەبوو، لە هەمان کاتدا زۆر گەلدۆست و نیشتمانپەروەر بوو، ئەمە کاری کردبووە سەر هەڵوێستی حیزبایەتی ئەو بیرە پێشکەوتوخوازەکەی پەلکێشی ناو حیزبی شیوعی عیراقی دەکرد، بەلام بیری عیراقچیەتی ئەو حیزبەو کەم بایەخی بە کێشەی گەلی کوردستان، لایان دەبووە هۆی ئەوەی فاخیر پەل بەرەو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بکێشێ. لەڕیزەکانی ئەو حیزبەش دڵی ئاوی نەدەخواردەوە چونکە ئەو کوڕی ناوچەکە بوو، ڕێبەری پارتی و تواناو بیرکردنەوەو پێک هاتنی خێلەکی ئەوی، لەکەسانی تر باشتر دەزانی . تا کوژرانیشی هەر _ خەریکی ئەم پەتپەتێنە بوو، نەیدەتوانی ڕێبازی ڕاستی خۆی، بیروباوەڕی خۆی . لەئاوێنەی ئەو دوو حیزبەدا ببینێتەوە. چونە ناو حیزبی شیوعی فاخر، لای شێخانی بارزان، (وەکو لەناو هەر خێلێکدا باوە)، بەیاخی بوون لە خێلەکەی (بارزانیان) حسێب دەکرا،

ئەوەرقی مەلا مستەفای لێ هەڵساندبوو.

هەروەها فاخیر لەبەر ئاستی رۆشنبیری ، تاکەکەسێك بوو کە رۆژێك لەرۆژان بتوانێ رۆڵی رێبەرایەتی لەناو بارزانیان بگێرێ و بکەوێتە رکێبەرکێ لەگەڵ مەلا مستەفا، ئەمەش ترسی مەلا مستەفای لێ زیاد کرد تا لەناو حیزبی شیوعیدا بوو، نەیانتوانی دەستی بۆ بەرن، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆریان هەوڵ لەگەڵدا تا بگەرێتەوە ناو پارتی ، پەیمانی پایەو پلەشیان پێ دا. تا رازیان کردو گەرایەوە ناو پارتی .دوای گەرانەوەی، شیوعیەکان لەحەمەد ئاغا دەگێرنەوە کە بەفاخیری وتبوو «تا لێیان دوور بووی ، پێمان نەدەوێران، بەلام لەمەودوا نامانهێڵن» جا بەراستی هەرواش دەرچوو.

(رفعت) ناوێکی خەڵکی هەولێر، کە تورکمان بوو، بەلۆری لەنێوان گەلالەو هەولێر باری دەگواستەوە. لەلایەن دەزگای پاراستنی پارتی یەوە سپێردرا بۆ کوشتنی جوهر برای فاخیر، ئەویش لە هاوینی* ١٩٧١ (جوهر)ی کوشت. دوای کوشتنەکە ،ئیدریس بانگی (رفعت)ی کردو بەناوی مەلا مستەفا مەبلەغێکی تریشی پارە پێ دا.

لەپرسەی (جوهر) دانیشتبووین حسین ـی برای گوتی «ئەگەر دەستی مەلا مستەفای تێدا نەبێ، ئێمە دەزانین چۆن تۆڵەی خۆمان

---

* مامخان شێروانی لەکتێبەکەیدا، کوژرانی (جمیل)ی برای فاخر بەهەڵە دەنووسێ و راستیەکەی بەم شێوەیە :

ـ (رفعت) ناوێکی خەڵکی هەولێر.. هەموو ئەو (رفعت)انەی کە لەنێوان دوو کەوانەکاندا هاتوون راستی یەکەی (رۆوف)ە.

ـ جەوهەریش نی یە کە لەهەولێر کوژراوە بەڵکو (جمیل)ە. بۆیە هەموو جەوهەرەکان دەبێ بکرێنە (جمیل).

ـ (حەسین)یش نی یە کە تۆڵەی براکەی خۆی کردۆتەوەو (رۆوف)ی کوشت. بەڵکو (سعید) ئەو کارەی کردووە، چونکە (حسین) لەساڵی ١٩٦٢ لەبارزان شەهید بووە.

* (جمیل)ی برای فاخر کوژرا نەك جەوهەر لە ١٤ی شوباتی ١٩٧١ کوژرا

دەکەینەوە». زۆری پێ نەچوو لەرێگای یەکێ لەکوڕە شێخەکانی بارزان بنەماڵەی حەمەد ئاغا چیرۆکی کوژرانی (جوهر) یان بۆ ڕوون بوەوە. حسین ئۆقرەی نەگرت و دەیەویست بەزووترین کات بەلانی کەمەوە بکوژی براکەی بکوژێتەوە. ئەوەبوو ڕۆژێك ئاگاداری وەرگرت کەوا (رفعت) لەگەڵ کوڕە پوورێکی دا لەگەلاڵەوە بەرەو هەولێر دەچێت. ئەویش لەگەڵ چەکدارێکی تری نەناسراو، لەنزیك (بەردەسپی) جادەی لێ دەگرێ کەلۆری یەکەیان ڕاگرت، (رفعت) دەموودەست زانی مەسەلەکە چی یە، هەروەك کوڕە پورەکەی بۆمی گێڕایەوە و گوتی: بەتورکمانی پێمی گوت «سەن گێت مانن ئۆردەر» واتا «تۆ بڕۆرەوە، منیان کوشت».

حسین و چەکدارەکەی تر، رفعتیان لەئۆتۆمبیل دابەزاند و لەپشت جادەکوشتیان. لەسەرەتاوە تەرمەکەیان بردە (گەلاڵە). دواتر کەس و کاری هاتن و بردیانەوە. پێش بردنەوەی تەرمەکەی چوونە لای مەلا مستەفا. ئەویش پێیان گووتبوو ( ئەو گوللەی بە رفعت کەوتووە بەمن کەوتووە).

حسین کەهەڕەشەی مەلا مستەفای بیستەوە، پەنای بۆ ماڵی شێخ عوسمان برد لە بارزان، ئیدریس هات و هەڕەشەی لە عوسمان کرد ئەویش، ناچار بە پێچەوانەی نەریتی شێخانی بارزان لە ـپەنادانـ حسینـی دا دەستیان. ئەوانیش بۆ شوێنێکی نادیاریان بردو کوشتیان، لەهەمان کاتیش فاخـــــیریان گـــــــــرت دوای ئەوە حەمەد ئاغای خاڵی مەلا مستەفاشیان گرت، هەرچەندە زۆریش بەتەمەندا چووبوو.

فاخیر بۆ ماوەیەك لەزیندانی رایات زیندانی کرا. لەناو زیندان و لەرێگای پاسەوانێك توانیبووی دەمانچەیەك دەست بخات. جارێکیش سەعید مەسیفی دەیەوێ بیکوژێ، بەلام فاخیر توانیبووی لەپڕ جەمانە لەملی سەعید بئاڵێنێ و بەزەوی دایدا.

زیندوومانی فاخیر ئۆقرەی لەمەلا مستەفا بڕی بوو، دەترسا رۆژێك دەرباز بێ. لەسەرەتای هاوینی ١٩٧٢ ئاگاداری مەسعودی کوڕی کردەوە کە دەبێ فاخیر بکوژن. ئەویش ئاگاداری کەریم سنجاری کردەوە تا کەسێکی گونجاو بۆ ئەم کارە ئامادە بکات.

وایان پێ چاك بوو کارەکە بە (حەمەدەمین رەشکە) ئەنجام بدەن

ئه‌و پیاوه خه‌لكی (ناوپردان)ه و سه‌ر به‌لقی باره گای مه‌كته‌بی سیاسی پارتی بوو. رۆژی جێ به‌جێ كردنی تیرۆره‌كه ، مه سعود بارزانی و كه‌ریم سنجاری هاتنه رایات. سه‌عید مه‌سیفی ئامۆژگاری حه‌مه‌ده‌مینی كرد كه وا باشتره كه‌ی فاخیر خه‌وی لێ كه‌وت، ئنجا ده‌رگای بۆ بكاته‌وه تا فه‌رمانه‌كه‌ی سه‌رۆك جێ به‌جێ بكات. حه‌مه‌ده‌مین چوار سه‌عات چاوه‌ڕوان بوو تا فاخیر خه‌وی لێ كه‌وت. به‌م جۆره فاخیر له‌زیندانی رایات وله‌كاتی خه‌ودا ، له‌سه‌ره‌تای هاوینی ١٩٧٢ تیرۆر كرا. مه‌سعودیش مژده‌ی كوژرانی بۆ مه‌لا مسته‌فا برد، حه‌مه‌د ئاغاش دوای هه‌ره‌سی شۆڕشی ئه‌یلول له زیندان ئازاد كرا. به‌ڵام هه‌ر هه‌مان رۆژی ئازاد بوونی ، له‌كاتێكدا به‌ڕێگاوه بوو، یه‌كێك له بارزانیه‌كان ڕێگای پێ گرت و پێ ی گوت «ها ئه‌وه ده‌چیته‌وه تا ببی به شێخی بارزان؟» ئه‌ویش پێی گووت«ئه‌وا كورد هه‌مووی ده‌فه‌وتێ كێ له‌بیری شێخی بارزانه». بارزانیه‌كه وه‌ڵامی دایه‌وه «نا، نامرخت له شێخایه‌تی بارزان خۆش كردووه به‌ڵام نایبینی» جا هه‌ر ئه‌و كاته و به‌به‌ر چاوی كۆمه‌ڵێك خه‌ڵكه‌وه ده‌ستڕێژی لێ كردو كوشتی.*

---

* كوژرانی حه‌مه‌د ئاغا به‌م شێوه‌یه نی‌یه ، پێش نیوه‌ڕۆی رۆژی ١٩٧٥/٣/٢٠ ، مه‌لا مسته‌فا به‌دوایدا ده‌نێرێ له‌گوندی (خه‌لان)ی نزیك حاجی ئۆمه‌ران دا ، گوایه بارزانی ده‌یه‌وێ داوای لێ بوردنی لێ بكات و له‌گه‌ڵی ئاشت ببێته‌وه ، به‌ر له‌وه‌ی كوردستان به‌جێ بهێڵێ .

به‌ڵام ئه‌وه‌یان بۆ كوشتنی بوو، جه‌وهه‌ری كوری له‌یادداشته‌كانی باسی ئه‌وه ئاكات كه باوكی له‌زیندانی رایات له‌گه‌ڵیاندا بووبن به‌ڵام ته‌رمی حه‌مه‌د ئاغاش له‌گه‌ڵ ته‌رمی ئه‌وانی تر له رۆژی ١٩٧٥/٤/٢ دۆزرایه‌وه.

# الجزء الاول

## مذكراتي داخل سجون الثورة الكردية

بقلم جميل محو (القائد والمؤسس) وسكرتير عام الحزب الديمقراطي الكردي في لبنان «البارتي»
١٩٨٢م_١٤٠٢ هـ ص (١٦٧_١٦٨_١٧٣_٢١٤_٢٢٨_٢٤٢_٢٤٥)

اخذت اجول داخل الديوان حيث انا مقيم فوجدت في الغرفة المجاورة لغرفتي بعض الاشخاص فاستفسرت عنهما فقيل لي عنهما محمد اغا ميرگه‌سوري وابنه فاخر هما مسجونان بأمر من البارزاني ، فدفعني الاخوة فقدمت نفسي لهما فتعارفنا وصرنا نجلس مع بعضنا نتحادث ونقتل الوقت الذي كان يمر بطيئا وكنا نتناول معا الطعام وفي بعض الاحيان اقضي معهما حتى منتصف الليل نتسامر ونتجاذب اطراف الحديث وكانت الاوامر مشددة فلم يكن يسمح لنا بان نترك غرفتنا الى خارج الديوان.

وفي يوم ١٩٧١/٦/٦ كنت جالسا في الديوان فجاءني فاخر وقال لي تعال نخرج الى الخارج ونتفرج قليلا فخرجنا فرأينا العشرات من الحراس البارزانيين مدججين بالسلاح وهم منتشرون على قمم الجبال محاولين القبض على عبيدالله فكانوا يطلقون النار على بعضهم لبعض.

***

كنت من وقت لأخر اترك غرفتي لزيارة المناضل فاخر ميرگه‌سوري ووالده فكنت احبهما لاخلاقهما الرفيعة فكنا نتحدث في بعض الاحيان وكان البحث يسوقنا الى السياسة وعن اوضاع الثورة بشكل عام، ففي احدى الجلسات التي كنا نعقدها من وقت لاخر قال لي: اخ جميل لماذا جئت الى هنا الم تعلم انه لايوجد قانون هنا او حرية للكلمة في ظل هذه الثورة العشائرية؟

***

وفي احد الايام جاء عزت اغا احد اصدقاء فاخر وسلمه ورقة «اخلاء سبيل» موقعة من البارزاني فأخذها وقبل ان يترك جاءني مودعا وقال: لقد انهوا قضيتي فان شاءالله عن قريب يأتي دورك اخ جميل وتذهب الى بيتك باذن الله وقال ايضا بأنه تكلم مع ادريس بشأني قائلا له ان بقاء الاخ جميل على هذه الحال وهو خسارة وهذا ليس من مصلحة

الثورة. وقبل ان يودعني مد يده الى جيبه واعطاني خمسة دنانير كمصروف خاص فشكرته على بادرته الطيبة ولكني ابيت بالرغم من الحاجه واصراره، ولكن قبل ان يتركني لوحدي قال:

انني اهديك هذا الراديو لذكرى من فاخر لاخيه جميل فاخذته شاكرا وانهمرت الدموع من عيني كل منا.

***

- مضت الايام وانا اتودد الى هؤلاء الحراس واكرمهم حتى تكونت صداقة فيما بيننا فاخذ البعض يخبرني عن اشياء لم اكن اعرفها من قبل فمثلا وعلى ذمة الراوي من الحراس قال: قبل ان يحولوني الى الزنزانة كان فاخر ميرگه‌سوري معتقلا في الغرفة رقم (٤) في السجن نفسه، فاحاط البارزاني السجن بالمدافع والرشاشات مع مئات من البشمركة من انصاره الاقوياء ووضع معسكرا حربيا في قرية خلان خوفا من ان يأتي انصار فاخر ويقتحمون السجن لاخراجه منه لان فاخر رجل خطير وقوي له انصار كثر في صفوف البشمركة فقبل مجيئي بيوم نقلوه الى جهة مجهولة لا يعرفها احد غير ان البعض كانوا يقولون انه نقل الى سجن رايات واخرون يقولون انه نقل الى داخل الاراضي الايرانية حيث يوجد سجن رهيب خاص بالمساجين المناوئين للبارزاني ،انما الحقيقة فلا يعرفها احد.

كما علمت ايضا بان جوهر اخو فاخر موجود مع بعض اتباعه المناضلين في داخل السجن رقم الغرفة (٤) وسمعت الكثير من الروايات من مختلف افراد البشمركة. وكان من بين المعتقلين جوهر محمد اغا ميرگه‌سوری وهو اخ فاخر وضع تحت المراقبة حيث قرر بدوره الاضراب عن الطعام عدة ايام حتى نقلوه من سجن خلان الى سجن رايات وبعدها اطلقوا سراحه.

ولم يمض وقت طويل على اطلاقه حتى اصدرت الاوامر ثانية من مقر البارزاني باعتقاله هو مع والده محمد اغا ميرگه‌سوري ووضعهما مع افراد عائلتهما تحت الحراسة المشددة بينما فاخر واخوه لم يكن احد يعرف عنهما شيئا حتى فيما بعد علم انهم اعدموا جميعهم رميا بالرصاص داخل سجن رايات الرهيب.

ففي ٢٦ اذار بقيت وحدي في حاج عمران بعدما تركها جميع الحراس مع البشمركة، حيث هربوا كلهم الى ايران والغرفة التي كنت انام فيها قد

اغلقوها ، فجلست مع (الشنطات) على ارض الشارع وقرب مقر حاج عمران فلم ار سوى ثلاثة حراس فقط في كل قرية حاج عمران مازالوا موجودين هناك فتوجهت نحوهم ووقفت حيث يقفون وإذ بإمرأة عجوزة وبرفقتها امرأة اخرى تحمل طفلا صغيرا على يدها يرافقيهما شخص من اقاربهما كان معي داخل سجن خلان، اسمه سعيد من اتباع فاخر وكان يبكي وهن ينتفن شعورهن فقلت لهؤلاء الحراس من هن هؤلاء النسوة وما لهن يبكين هكذا فاجابني احدهم قائلا: لا تسأل عن شيء كي لاتقع في الفخ مرة اخرى يا كاك محو فما عليك الا ان تلتزم الصمت فهو اسلم لك ثم تابع وقال هذه العجوز هي ام فاخر ميرگه سوري والامرأة التي معها زوجة جوهر شقيق فاخر ومنذ يومين قد اختفيا ولا احد يعرف شيئا عن مصيرهما فعند سماعي هذا تركت هذه المشاهد الاليمة وقلبي يحترق اسى على فاخر وجوهر لأنهما من اخلص الاصدقاء واوفاهما الذين عرفتهم في تاريخ حياتي وذهبت في الطريق التي تؤدي الى الحدود الايرانية وقلت عساني ان ارى احدا من البارزانيين لكي اخبره ان يكلم مسعود بخصوصي فتركت الشنطات حيث كانت ومشيت مسافة عدة كيلومترات فوجدت سيارات شحن ايرانية وضباطا ايرانيين وبرفقتهم عبدالمهيمن البارزاني قادمين الى حاج عمران.

ولما شاهدني قال ما الذي اتى بك الى هنا؟، قلت لم يبق احد غيري فطلب مني ان اصعد الى السيارة ورجعنا الى حاج عمران فوجدت (الشنطات) في مكانها والنسوة تبكين امام مقر حاج عمران فذهب عبدالمهيمن نحو النسوة يسألن فاخذن يشرحن له امرهن ويرجونه ان يوصل طلبهن الى البارزاني كي يأمر بالافراج عن الزوج و اولاده فاخر وجوهر والاخرين بينما بقيت بعيدا عنهم كي لا يعرف عبدالمهيمن البارزاني باني اعرفهن قبلا فاخذت الشنطات ووضعتها داخل سيارة عبدالمهيمن البارزاني.

## مذكرات بهاء الدين نوري

### الطبعة الاولى

تشرين الثاني ١٩٩٢ ــ كردستان العراق
الصفحة ٢٤٩:

لم نتردد في ادانة التمرد الذي اعلنه فريق منشق من البارتي بزعامة ابراهيم احمد، ضد البارزاني، وجدنا في هذا التمرد رضوخا للسلطة وسميناه في اول بيان صادر من قيادة منظمة الاقليم موقفا خيانيا، واوصينا مسلحينا بالمشاركه في مقاتلتهم. وقاتلوهم فعلا في منطقة قره داغ. الا اننا ظللنا ننظر الى الجناح التمرد كمنظمة سياسية قومية سائرة على نهج خاطىء وحتى خياني و وقابلة لان تغير هذا النهج وتعود الى المعسكر الاخر. ومن هنا اختلف موقفنا عن موقف البارتي والبارزاني ازاء المتمردين، وقد تعرضنا لضغط شديد كي نتخذ موقفا مماثلا لموقف البارتي ونسمي المتمردين جحوشا خونة. وخلق ذلك متاعب جدية لنا واصبحنا امام الاختيار الفعلي لمعرفة ما اذا كنا نحتفظ باستقلالية الموقف ام نكون تابعين لغيرنا.

وشارك الكادر الشيوعي الفدائي فاخر ميرگه سورى ــ وهو ابن خال الملا مصطفى نفسه ــ في ممارسة الضغط علينا لحملنا على اتخاذ الموقف الذي يرضي البارتيين. واتضح لاحقا ان موقف فاخر هذا لم يكن بمعزل عن صفقة سرية كان قد ابرمها مع عائلة البارزاني.

ويقول في الصفحة ٢٥١:

كان فاخر ميرگه سوري لايزال على صلة حزبية وان ،غدت واهية، معنا حين تلقيت منه رسالة .. واظن انها كانت في شباط ١٩٦٧ مفادها «ان حكم الثورة قد نفذ في الخائن جلال الطالباني، فاعدم رميا بالرصاص». تصورت للوهله الاولى وكان الطالباني قد اختطف وجلب الى منطقة بالك وقتل. وسرعان ما اتضح ان الامر ليس على هذه الصورة. فكتبت بدوري رسالة مستعجلة الى فاخر اوردت فيها استفسارات وطلبت منه الجواب الفوري مع المراسل، تهرب فاخر من الاجابة طيلة يومين. ثم اجابني بشكل اوجد لدي الشكوك ليس فقط حول صحة الخبر، بل كذلك حول العلاقة الشخصية بما كتب عنه الينا. وبعد ايام استدعيته وحققت معه واحرجته باسئلة معينة. فاعترف

امامي بانه اتفق مع بعض ابناء البارزاني على تدبير قتل الطالباني.
واتضح انه كان قد استلم لهذا الغرض الاسلحة والنقود وتعهد بالتنفيذ.
اما كيف نفذ حكم الاعدام المزعوم، فاليك ما ذكره فاخر بنفسه امامنا:
سلمت مبلغا من المال الى عميل للامن العام كردي مقيم في اربيل يدعى عبدالوهاب، لقاء مشاركته في تدبير اغتيال جلال الطالباني، وبعد ايام كتب الي عبدالوهاب يخبرني انه اتفق مع عميلين بعثيين للامن العام في بغداد لكي يقوما بالاغتيال.
ويضيف في الصفحة ٢٥٢:
وقال هذان لعبدالوهاب بانهما سينفذان المهمة في الساعة كذا من يوم كذا، كما اخبرني هو، وفي الموعد المحدد، وقبل التوثق من صحة ماسيكون اخبرت البارزاني برسالة مستعجلة بان حكم الاعدام قد نفذ في الخائن الطالباني.
هكذا تورط فاخر نتيجة تصديق ماقاله بعض الجواسيس، وورط البارزاني معه وعمم الاخير خلاصة الخبر في برقية الى مقرات البشمركه، كما اخبر في نفس اليوم وزير الدفاع شاكر محمود، الذي التقى به في برسرين، بان الطالباني قد صفي فاجاب الوزير انه لم يسمع شيئا من هذا القبيل.
ويبدو ان المكتب السياسي للپارتي صدق الخبر في بادىء الامر ولكنه اخذ يشك بعدئذ. وقد سأل احدهم رفيقا لنا عن معلوماتنا بهذا الصدد فاجابة:
ــ لم نعرف مدى صحه هذه الاشاعة. لكن من المؤكد ان الخبر لم يأت من اربيل الى هنا بل نقل من هنا الى اربيل.
انهينا العلاقة الحزبية مع فاخر بعد ان اتضح لنا على اثر الحادث المذكور انه نقل خدماته فعلا الى جهة اخرى، واعتبرناه منظما الى الپارتي، وفي اخر لقاء معه ابلغته بما يلي:
ــ انهم سيرفعونك ويضعونك في طوابق عليا من المبنى ثم يلقون بك من هناك الى الارض ويهشمون رأسك تهشيما.
وفي الصفحة ٢٥٣ يقول:
واخر شيء اكتشفناه لدى فاخر، قبل تصفيه علاقته معنا تصفية

تامة، هو انه كان منشغلا بتكوين منظمة جديدة باسم (پاراستن)ـ منظمة استخباراتية تابعة لقيادة البارزاني والپارتي في تلك الفترةـ وقد تلقينا اكثر من رسالة من شيوعين سابقين ، وحتى من اناس لم يقتطعوا العلاقة الحزبية معنا، ذكروا فيها ان فاخر اتصل بهم وطلب منهم التعاون في تكوين هذه المؤسسة ، التي اقصى نفسه عنها ، لاحقا وانيطت مسؤوليتها بمسعود البارزاني..

وفي الصفحة ٤٠٧ يقول:

وقد ذهب ضحية هذا الاسلوب الهمجي حتى الفدائي الطاعن في السن (٨٥ سنة) حمه اغا ميرگه سورىـ الخال الحقيقي للبارزاني، مع ابناء واحفاد له عام ١٩٧٥.

اذ قتلوا وهم سجناء بامر من الملا مصطفى البارزاني نفسه.

المركزية للحزب هما السيدان اسماعيل ملا عزيز وهاشم عقراوي وذلك بسبب انتقادهم للسياسة الخاطئة التي يمارسها الملا مصطفى البارزاني.

وقد وجه الزعماء الثلاثة مذكرة شديدة اللهجة للسيد البارزاني وهي الثالثة التي يوجهونها اليه خلال الشهرين الماضيين.

وقد اتهمت المذكرة البارزاني بالفردية والدكتاتورية والعمل لمصلحة الدول والمخابرات الاجنبية ضد أماني ومصلحة الشعب الكردي وحذرته من التمادي لممارسة هذا النهج الخاطىء الخارج على سيادة القانون.

وفيما يلي النص الكامل للمذكرة التي بعث بها الزعماء الاكراد الثلاثة بتاريخ ١٩٧٤/١/٢٩ وتنقلها (الراصد) عن جريدة (المحرر) البيروتية حيث نشرت هذه المذكرة على صفحاتها يوم الاول من امس (١/٢٧)، كما تناولتها عشر صحف بيروتية اخرى، وذلك نظرا لاهمية وخطورة ما ورد فيها.

* الصقتم التهم الباطلة بمخلص الحزب والثورة دون الاستناد الى اي قانون يبرز مواقفكم هذه... كما ال اليه مصير المناضل فاخر ميرگه سوري عضو اللجنة المركزية الذي اختفى باشارة منكم دون محاكمة او تحقيق او حتى اعلان عن التهمة التي استندتموها اليه، ولم تجرأ قيادة حزبية حتى الان ان تحاسبكم لابل ان تفاتحكم على هذا التصرف. فهل هذا يتفق وكرامة الانسان...؟ وهل وجدت مثل هذه الاعمال في كل ثورات العالم...؟ وهل هذا تصرف قائد ورئيس حزب ديمقراطي لقادته ورفاقه في السلاح والنضال...؟

ان ما حصل للاخ فاخر وغيره يحدث لعشرات الناس في كردستان على ايديكم وايدي معتمديكم.

* الراصد- بغداد- ١-١٧/شباط/١٩٧٤ العدد (٢٠٩).

# انشقاق خطير داخل الحزب الديمقراطي الكردستاني

## ٣ من زعماء الحزب يحذرون البارزاني من التمادي في سياسته المشبوهة

«دوای ئه‌وه‌ی سه‌رکردایه‌تی بارزانی، فاخر میرگه‌سوری ئه‌ندامی لیژنه‌ی مه‌رکه‌زی پارتی بێ سه‌روشوێن کرد، هیچ ئه‌ندامێك نه‌ له‌ مه‌کته‌بی سیاسی، نه‌ له‌ لیژنه‌ی مه‌رکه‌زی ناره‌زاییان ده‌رنه‌بڕی یادداشتێکیان به‌رزنه‌کرده‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی بزانن بۆچی بارزانی وای له‌ فاخر کرد.

ته‌نها که‌سانێك که‌ کارێکی له‌و بابه‌ته‌یان کردبێ، عزیز عقراوی ئه‌ندامی مه‌کته‌بی سیاسی و اسماعیل ملا عزیزو هاشم عقراوی ئه‌ندامانی لیژنه‌ی مه‌رکه‌زی پارتی بوون، به‌ڵام دوای ئه‌وه‌ی له‌سه‌ره‌تای ١٩٧٤ له‌ بارزانی جیا بوونه‌وه‌.

یادداشته‌که‌ له‌ رۆژی (١/٢٧) له‌ (المحرر)ی به‌یروتی بڵاوکراوه‌ته‌وه‌، (الراصد)ی به‌غدادیش له‌ ژماره‌ی (٢٠٩)، ١٠-١٧ شوباتی ١٩٧٤ دوباره‌ بڵاوی کردۆته‌وه‌.

خاڵی پێنجه‌می له‌سه‌ر چاره‌نووسی فاخر میرگه‌سوری‌یه‌. که‌ ده‌قه‌که‌ی له‌ خواره‌وه‌ نوسراوه‌.

هه‌روه‌ها عزیز عقراوی له‌ یادداشته‌ ده‌ست نووسه‌که‌ی دا باسی کوژرانی فاخر ده‌کات و ده‌ڵێ یه‌کێکه‌ له‌و هۆیانه‌ی که‌ پاڵی پێوه‌نام واز له‌ پارتی و بارزانی بێنم».

- نووسه‌ر -

* مذكرة الزعماء الثلاثة تسجل ٢٢ اتهاما ضد البارزاني وتتهمه بالتآمر على الحزب الديمقراطي الكردستاني وقتل عشرات الثوار.

حدث انشقاق داخل الحزب الديمقراطي الكردستاني بزعامة السيد عزيز عقراوي عضو المكتب السياسي وعضوين من اعضاء اللجنة

# بەشێك لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنووسی لەگەڵ ممتاز حەیدەریدا

* لە تەممووزی/ ۱۹٦۲ حزب بڕیاری دا کە لە ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان کاربکەم بۆ ئەم مەبەستە بە نهێنی لەلایەن شەهید حسن عوینەوە گوێزرامەوە بۆ شاری کەرکوك، لەوێدا بۆ ماوەیەك لەگەڕەکی ئازادی لە ماڵێکی حزبی دا کارمان دەکرد.

لە پاشاندا حزب بە نهێنی خانوویەکی گرت بۆ شەهید فاخر مێرگەسۆری لە گەڕەکی (شاطرلو) و بڕیاردرا کە بە نهێنی ببێتە بارەگای (ڕێگای کوردستان) بەم شێوەیە لە ماڵی کاك فاخر ڕۆژنامەکەمان و بڵاوکراوەی ناوخۆیی چاپ دەکرا تا کودەتای ۱۹٦۳.

س/ چۆن هەواڵی کودەتاکەتان زانی و ئایا کاری نەکردە سەر بەڕێوەبردنی ئیش و کارتان؟

وەلام/ ڕۆژی ۸/ شباط ڕۆژی هەینی بوو.ئێمە خەریکی چاپ کردنی نامیلکەیەك بووین و لە ناکاو لە دەرگا دراو هاوڕێ (عزیز محمد) هاتە ژوورێ و بەیاننامەیەکی بۆ هێناین و بە ئێمەی ڕاگەیاند کە (انقلاب) کراوە دەبێ ئەم بەیاننامەیە بە زووترین کات چاپ بکەین بۆ ئەوەی هاندەرێکی جەماوەریی بێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کودەتاکە. ئێمەش (۳) هەزار (نسخە) مان لەو بەیاننامەیە چاپ کرد.

دایکی ڕەوشن (خێزانی شەهید فاخر) هەرچەندە زۆر ناساغ بوو بەلام بەیاننامەکەی گواستەوە.

بەپێی بڕیاری حزب دەزگای چاپەمەنی یەکانمان شاردەوە لە ۱۹٦۳/۳/۲۰.

* ڕێگای کوردستان ژمارە ٥٠، سەرەتای نیسانی ۱۹۹۲

# دەنگ دانەوەی قەتلوعامکردنی بنەماڵەی میرگەسۆری لە رۆژنامەکانی عێراقدا

پاش دۆزینەوەی تەرمەکان لە ١٩٧٥/٤/٢ کە هاوکات بوو لەگەڵ گەیشتنی هێزەکانی حکومەت بۆ گەلالە ژنەکانی بنەماڵەو خەڵکی ناوچەکە تەرمکانیان گواستەوە بۆ گەلالە لەوێش بۆ هەولێر هەر لەگەڵ گەیشتنی تەرمەکان لەگەلالەوە بۆ هەولێر، رۆژنامەکانی عێراق بەنووسینی تایبەتی و مانشێتی گەورەوە هەواڵی ئەو تاوانەیان بڵاوکردەوە.

## طريق الشعب

## جماهير اربيل تدين جرائم التمرد المنهارة *

روعت جماهير اربيل يوم امس الاول بسماعها نبأ الجريمة الفظيعة التي ارتكبها قادة التمرد المنهار بحق الشخصية الكردية البارزة «حمد آغا ميرگه سوري» وابنائه وعدد من المناضلين.

ومساءامس استقبلت اربيل الباسلة جثث الشهداء الطاهرة. فقد وصل من قرية (بابكراوى) الواقعة قرب رايات، جثمان كل من «حمد اغا ميرگه سوري» وثلاثة من ابنائه هم جوهر ورشيد واسعد*. وكذلك جثماني الرفيق خليل سلطان (قلندر) وهو عضو في الحزب الشيوعي العراقي منذ عام ١٩٥٩، ومحمد سليم گوردي.

لقد كان الشهيد حمد اغا من المساهمين الاوائل في الحركة الكردية وساهم في الانتفاضات التي قام بها شعبنا الكردي في الثلاثينات والاربعينات وحكم عليه في اعقاب سقوط جمهورية مهاباد الديمقراطية بالسجن المؤبد، ولم يغادر السجن إلا بعد انتصار ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، ورزىء بأستشهاد ابنه الكبير الشيوعي الشجاع الرفيق حسين، كما اغتيل ابنه جميل من قبل جلاوزة الملا قبل اعوام.

اما مصير ولده فاخر فلايزال مجهولا حيث كان معتقلا في سجن رايات الذي تشرف عليه الزمرة المنهارة.

وكان الشهيد صديقا لحزبنا الشيوعي العراقي، وربى اولاده على حب الحرية والنضال ضد الاستعمار والرجعية، وفي سبيل الحقوق القومية لشعبنا الكردي ومن اجل الحكم الذاتي.

* طريق الشعب: العدد ٤٧٠ الجمعة ١٩٧٥/٤/٤

* مجيدی کوری حەمەد ئاغاش لەگەڵ تەرمەکان دۆزرایەوە

وقد ترك نبأ استشهاده واولاده والرفاق الاخرين ـ بهذا الشكل المروع ـ حزنا عميقا لدى جماهير اربيل وكل الجماهير الكردية التي تعرف في حمد اغا ميركه سوري ابنا بارا للشعب الكردي، قضى اعوامه الخمسة والثمانين في خدمة الشعب واهدافه القومية العادلة.

المجد والخلود للشهداء حمد اغا ميركه سوري واولاده ورفاقه الشجعان.

والخزي والعار للقتلة المجرمين.

## الجمهورية

## الكشف عن المزيد من جرائم للزمرة العميلة المنهارة*

واكد نبأ لبعثة وكالة الانباء العراقية ان القيادة العميلة للتمرد قد اعدمت فاخر حمه ميركه سوري عضو مايسمى باللجنة المركزية مع ابيه واشقائه التسعة بعد اعتقالهم منذ عام ١٩٧٢ في سجن رايات الرهيب وكانت طلائع قواتنا المتقدمة قد عثرت امس الاول اثر دخولها منطقة گلاله على جثث هؤلاء وهم حمد آغا ميركه سوري خال الخائن ملا مصطفى ووالد فاخر سوار آغا احمد* من ابناء عمومة الملا وكانت ايديهم وارجلهم قد ربطت بسلاسل حديدية وقد اخترقت مؤخرات رؤوسهم عدة طلقات من الرصاص.

ويقول النبأ ان سعيد مصيفي وهو ما يسمى بالمشرف العام على السجن قد قام بعملية الاعدام التي تمت في السادس والعشرين من الشهر الماضي بالأشتراك مع محمد خالد البارزاني وبأيعاز من القيادة العميلة عند هروبها من رايات.

وكان فاخرميركه سوري على خلاف مع الملا على اثر دفعة لعناصر من زمرته بقتل شقيق فاخر المدعو جميل ميركه سوري في اربيل وقيامه بعد ذلك بأعتقال فاخر في سجن رايات منذ ١٩٧٢ مع ابيه واشقائه.

*الجمهورية: العدد ٢٢٩٩ الجمعة ١٩٧٥/٤/٤

* له گه ڵ دا نه بوو (خليل)ی برازای حه مه د ئاغا له گه ڵ ته رمه كان دوزرايه وه

فاخير مێرگه‌سوری ، كوری حه‌مه‌دئاغای مێرگه‌سۆری یه‌و له‌ساڵی ١٩٣٧ له‌دایك بووه‌و سه‌ربه‌عه‌شیره‌تی شێروانی ــ ین .

كوشتنی فاخیر مێرگه‌سوری و باوكی و براكانی سه‌رگوزشته‌یه‌كی دوورودرێژو پڕ له‌نهێنی و رازی ئه‌وتۆن ، كه‌تاكو ئێستا هه‌موو سه‌ره‌داوه‌كانی به‌دیار نه‌كه‌وتون زۆر له‌لایه‌نی ململانێ و دژایه‌تی كردنی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی دژبه‌بنه‌ماڵه‌ی مێرگه‌سۆری به‌بزری ماونه‌ته‌وه‌ ، چونكه‌ توندو تیژی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی و ده‌زگای پاراستن ، هه‌میشه‌ رێگر بوون له‌به‌رامبه‌ر په‌رده‌لادان له‌سه‌ر ئه‌و

كێشه‌یه‌ ئه‌گه‌رچی له‌ئه‌ورووپا چه‌ند بابه‌تی جۆراو جۆرو پچڕ پچڕی له‌سه‌ر نووسراوه‌ به‌لام كێشه‌كه‌ مافی خۆی نه‌دراوه‌تێ و په‌رده‌ له‌سه‌ر هه‌موو لایه‌نه‌ شاراوه‌كانی هه‌ڵنه‌دراوه‌ته‌وه‌ .

## سه‌ره‌تای ده‌ست پێكردنی ململانێ

یه‌كێك له‌تایبه‌تمه‌ندیه‌كانی بنه‌ماڵه‌ی بارزان ، ئه‌و خۆسه‌پاندنه‌یه‌ به‌سه‌ر ناوچه‌ی بارزان و شێروان ــ مه‌زن و عه‌شیره‌ته‌كانی ئه‌و ناوچه‌یه‌ ، كه‌ هه‌موو شێوازێك به‌كارده‌هێنن بۆ ئه‌وه‌ی كۆنترۆڵی ناوچه‌كه‌یان له‌به‌ن ده‌ست ده‌رنه‌چێ .. هه‌ربۆیه‌ یه‌كێك له‌و به‌ربه‌ستانه‌ی كه‌له‌به‌رده‌م خه‌ڵكیان دروست كردوه‌ قه‌ده‌غه‌كردنی حزبایه‌تی و ده‌ست تێ وه‌ردانه‌ له‌دنیای سیاسه‌تدا *.
كه‌چی فاخیر مێرگه‌سۆری ، نه‌ك هه‌ر نه‌چووه‌ ریزی ئه‌و حزبه‌ نه‌ته‌وه‌یه‌ی كه‌ مه‌لامسته‌فای بارزان سه‌رۆكی بوو ، به‌ڵكو رێبازی (ماركسیزم ــ لینیزم)ی هه‌ڵبژاردو چووه‌ ریزی حیزبی شیوعی عێراقه‌وه‌ .

* له‌ناوچه‌ی بارزان (قه‌زای مێرگه‌ سۆر ، ناحیه‌ی شێروان ، ناحیه‌ی بارزان و هه‌موو دێهاته‌كانی سه‌ر به‌ناوچه‌كه‌ ) حزبایه‌تی به‌هه‌موو شێوه‌یه‌ك قه‌ده‌غه‌یه‌ ، ته‌نانه‌ت تاكو ئێستا لیژنه‌یه‌كی ناوچه‌ یان باره‌گای رێكخراوی هیچ حزبێك له‌و شوێنانه‌دا نی یه‌و هه‌ركه‌ سێكیش بچێته‌ ریزی هه‌ر حزبێك به‌لاده‌ر له‌قه‌ڵه‌م ده‌درێ و سه‌ری خۆی ده‌خاته‌ ژێر ره‌حمی شمشێری بنه‌ماڵه‌ی بارزانی یه‌وه‌ .

ئه وانه ی که له نزیکه وه شاره زاییان له گه ڵ فاخیردا هه بووه ده ڵێن:

فاخیر له و باوه ره دابوو که ناوچه که ی ئه وان به تایبه تی و کوردستان به گشتی ته نها له رێگای تێکۆشانی چینایه تیه وه ده گاته ئامانجه کانی خۆی ، جا ئه گه ر حزبایه تی له ناوچه ی بارزان و شێروان و مێرگه سۆر قه ده غه بوبێ . ئه وا چونه ناو رێزی حزبی شیوعی بۆ (مللـه ت)* به (کفر) ده درایه قه له م به مجۆره چونه ناو رێزی حزبی شیوعی ـ سه ره تای ده ست پێ کردنی ململانێ ی سیاسی بوو ، له نێوان بنه ماڵه ی بارزانی و بنه ماڵه ی حه مه د ئاغای مێرگه سوری سه ره رای ئه و ململانێ یه کۆمه لایه تیه شاراوه یه ی که له مێژه بوو له نێوان بنه ماڵه ی بارزان و عه شیره تی شێروانی کلپه ی سه ندبوو .

هه رچه نده ئه م هه ڵوێسته ی فاخر به دڵی مه لامسته فای بارزانی و بنه ماڵه ی نه بوو به لام ئه وسووربوو له سه ر هه ڵبژاردنی ئه و رێبازه ئه مه ش وای کرد که ململانێ و توره یی بنه ماڵه ی بارزان به رامبه ر به فاخیرو بنه ماڵه که ی قوڵتر بکات .

دوای شه ری نێوان سۆفیه کانی برادۆست و بنه ماڵه ی بارزانی ، له ساڵی ١٩٥٨ دا مه لامسته فا ، فاخری به وه تاوانبار کرد که له کاتی به شداری کردنیدا له گه ڵ شیوعیه کان تـــــــه قه ی له بارزانی کردوه و هه وڵی کوشتنی داوه *.

* مللـه ت: به مانای میلله ت، بنه ماڵه ی شێخی بارزان، به هه موو عه شیره ته کانی (شێروانی ، مزوری، دۆله مه ری، ئه رگوشی و ...تد) وه هه موو ئه و خه ڵکانه ی سه ر به ناحیه ی شێروان و بارزان و قه زای مێرگه سۆرن ، به مللـه ت ناوی ده به ن ، واته ره عیه ت ، ره عیه ت (مللـه ت) ته نها بۆی هه یه مل که چ بکات بۆ بنه ماڵه ی شێخه کانی بارزان و ده ستوور رێ نوێنیه ئاینی یه کانی خودانی بارزان ومافی ئه وه یان نی یه به شداری له هیچ چالاکی کۆمه لایه تی وسیاسی و ئاینی بکه ن.

---

* هه میشه مه لا مسته فا بۆ پاساوی رق لێبونه وه ی له فاخیر مێرگه سۆری ، ده یووت : فاخیر له شه ری لۆلان هه وڵی کوشتنی داوه و فیشه کێکی له قاچی داوه ،

ئه وه بوو دوای سالی ١٩٥٨ هاتوته رواندزو ماوه یه ك له وێ خۆی حه شار داوه و به کاری حزبایه تیشه وه مه شغولی بووه ، دواتر مه لامسته فا به پیلان و شێوازی هه مه جۆره وه فاخیری ته سلیم به حکومه تی به غدا کردوه*، به لام شێخ صادق ی برازای مه لا مسته فاو هاوسۆز له گه لّ بیرو بۆچۆنه کانی فاخر له ریگای تواناشه خصیه کانی یه وه فاخیری رزگار کردو هاته موسل له وێ ماوه یه ك لای (ابو حکمت) مایه وه و به کاری حزبایه تی سه رقال بوو و په ناشی برده به ر ئیش و کار وه ك دارتاشی و پیلاو بۆیه کردن بۆ مسۆگه ر کردنی بژێوی خۆی ، چه ند جار به ندکراوه و دواجاریش چوه ته که رکوك ماوه یه کیش چاپخانه ی (رێگای کوردستان) له مالی ئه واندا بوو تا رووخانی عبدالکریم قاسم ئینجا هاتۆته هه ولێر

---

حزبی شیوعی له رێگای جمال حیدری هه ولێکی زۆری دا ، بۆ ئه وه ی نێوان مه لا مسته فاو فاخیر تێکنه چێ ، به لام بێ سوود بوو، بۆیه جارێکیان جمال حیدری به بارزانی وتبوو: باشه ئه گه ر راسته رانکه که ت• هه لکه بۆ ئه وه ی شوێنی گولله که ببینین.

ئه و قسه یه وای له مه لا مسته فا کرد ، تا شه هید بوونی جمال حیدری هه ر رقی لێ بێت .

• ئه مه راست نی یه بروانه لاپه ره ٢١

# هێمنیەکی کاتی

لە ساڵی ١٩٦٣ دا حسین ی برای فاخیر لە بەرگری کردندا لە خاکی بارزان و ناوچەکە لەوشوێنە دەکوژرێ ، دواتریش پەیوەندی نێوان حزبی شیوعی و بارزانی رووەو باشتر چوو ، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە حزبی شیوعی شاری بەجێ هێشت و سەنگەری شاخی لەگەڵ بارزانیدا هەڵبژارد ، ئەم دوو هۆکارە بوونە رێگا خۆش کەرێك بۆ ئاشت بوونەوەی فاخرو مەلامستەفای بارزانی .

لە تێکۆشانی شاخدا فاخر لە ناو حزبی شیوعی رۆڵێکی کاریگەری دەبینی لە بواری پێشمەرگایەتی و شەری بەرەییدا ، بەتایبەتی لە شەرەکانی هەندرێن لە ساڵی ١٩٦٦ دا لە دواتر ناکۆکی یە نێوخۆییەکانی ناوحزبی شیوعی و چەند هۆیەکی تر وای کرد فاخر لە حزب جیاببێتەوەو ماوەیەك دابنیشێ و لەو ماوەیەدا چوەتە ریزی پارتی و چەندین نەبەردی تۆمار کردووە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و سەرپەرشتی لێدانی بیرە نەوتیەکانی کەرکوکیشی کردوە ، نەك وەك هەندێك کەس دەیانەوێ ئەو زانیارانە سەراوژێر بکەنەوە ئینجا لە ١٩٧٠ بارزانی کردی بەلێپرسراوی لقی چواری پارتی لە سلێمانی وکەرکوك .

فاخر لە کاتی گفتوگۆی نێوان میری و بارزانی دا لە ١٩٧٠ چەند جارێك لەگەڵ نوێنەرەکانی پارتی چووەتە بەغدا ..

دڵ رەشی و هەمیشە رق و قینەی پەنگ خواردووی بنەماڵەی بارزان، ئەم هاتۆچۆیەی فاخریان بەهەل زانی بۆ ئەوەی ، تۆمەتی بخەنە پاڵ و برینەکۆنەکانی ململانێ کەیان نوێ بکەنەوەو لەکاتی ئاشتیدا رێگا نەدەن فاخر بچێتەوە ناوچەی مێرگەسورو ، لە ترسی ئەوەی کە قطبێك بۆخۆی دروستبکات و لە هێبەتی بنەماڵە کەم بکاتەوە ، بۆیە بە پیاوی رژێم و جاسوس لە قەڵەمی دەدەن .

سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧١ بە پیلانێکی پاراستن (جمیل)ی برای فاخر دەکوژرێ و جارێکی دیکەش دوژمنایەتیەکۆنەکە نوێ دەبێتەوە ، پاش ئەمەی بکوژی (جمیل) لە لایەن سعیدی برای فاخر دەکوژرێتەوە ، چل رۆژ دوای کوژرانی (جمیل)ی برای فاخر ، مەلا مستەفا فاخرو باوکی راپێچ دەکات ودەست بەسەریان دەکات و بەم

جۆرە پەردەیەکی تری تراجیدیای بەندی و بێ سەرشوێن کردنی فاخر دەست پێ دەکا ...

## دوای تەمموزی ۱۹۷۲ فاخر چی بەسەرهات ؟؟

دوابەدوای ئەوەی کەمەلامستەفا فاخر و باوکی لە دیلمان دەست بەسەر کرد پاش دووهەفتە ئازاد کردنیان جارێکی دیکە فاخر دەست بەسەرکرایەوە بەلام چەند رۆژێکی پێ نەچوو کە جارێکی دیکە (فاخر)یان بەند کردەوە .. تا ساڵی ۱۹۷۲ لە بەندیخانەی خەلان بوو کەس و کاری دەچوونە لای دوای تەمموزی هەمان ساڵ ، فاخر بێ سەروشوێن بوو ، تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێ بنەماڵەی بارزانی ئەو رازەیان ئاشکرانەکردووە ، ئەگەر چی لەم لاو ئەولا چەند هەواڵ و زانیاری هەیە کەفاخرلە هەمان ساڵدا کوژرا بێ . جمیل محو .. لەکتێبی ( مذكراتي داخل سجون الثورة الكردية) تەئکید لەسەر ئەوەدەکاتەوە کەکاتێ ئەوەیان بردۆتە بەندیخانەی خەلان (فاخر) گواسترابوەوەو کەس نازانێ بۆ کوێیان بردوە ، هەروەها مامخان شێروانی ـ یش لەکتێبی (بارزان و رەچەلەکی بارزانیان) لەدوا لاپەریدا (ل ١٤٠) تەئکید لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە بە فەرمانی مەلامستەفا لەساڵی ۱۹۷۲ فاخر کوژراوە .

## نوێترین زانیاری

زۆر لەبەندییەکانی بەندیخانەی رایات ، سەرگوزشتەو زانیاری زۆریان دەربارەی قەتلوعام کردنی بنەماڵەی مێرگەسوریان لایە .

(د.ع) کە یەکێکە لەبەندییەکانی ساڵی ۱۹۷٤ لەرایات ، دەڵێ تا ساڵی ۱۹۷٤ فاخر مێرگەسۆری هەر لەزیندان بوو ، ئەو رایە بەپێچەوانەی ئەوقسانەیە کە پێشتر دەیانووت فاخر لەساڵی ۱۹۷۲ کوژراوە .

(د.ع) لەدانیشتنێکی تایبەتیدا بەم شێوەیە سەرگوزشتەی خۆی و فاخر دەگێرێتەوە :

لەسەرەتای مانگی ئایاری ۱۹۷٤ منیان بردە ژورێك لەبەندیخانەی رایات زۆر هیلاك بووم ، لەبەرلێدان و تەحقیق کردن و شەوی دەروونی .. ژوورەکە پەردەیەکی (گوش) لێکی جیادەکردەوە ،.

پاش ماوه یه‌کی که‌م پیاوێکی که‌له‌گه‌ت ، هاته لام و دڵنه‌وایی کردم ، خۆی پێ ناساندم و ووتی : من (فاخر حمد ئاغای مێرگه‌سۆریم) ئیتر هه‌موو نیوه‌ڕۆیه‌ك له‌ به‌شه‌ خواردنه‌که‌ی خۆی ، دوور له‌ چاوی پاسه‌وانه‌کان خواردنی ده‌دامێ ، له‌گه‌ڵ ڕۆژگاردا لێك نزیك بوینه‌وه، باسی سیاسه‌ت و مارکسیه‌تی بۆده‌کردم و ئه‌و قسه‌یه‌ی دووپات ده‌کرده‌وه‌ که‌ ئه‌م شۆڕشه‌ کۆتایی هاتووه‌و ده‌روخێ و چه‌ند گه‌نجێك وه‌کو (شهاب شێخ نوری) خه‌ریکی دروست کردنی (حزبێکی مارکسین) ، د.ع له‌ قسه‌کانی به‌رده‌وام ده‌بێت و ده‌ڵێ :

(له‌ مانگی حوزه‌یرانی ١٩٧٤دا فاخریان بانگ کردو دوای دووسه‌عات تاخیر بوون ، گه‌رایه‌وه‌و پێ وتم : من ئه‌کوژرێم ، بۆیه‌ ئه‌گه‌ر ئازاردبویت و هه‌ر..که‌سێکت دیت به‌ئه‌مانه‌ته‌وه‌ ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ی پێ رابگه‌یێنه‌ ، چونکه‌ ئه‌مشه‌و محضری ئیعدامیان پێ ئیمزا کردم ، که‌ بریتی بوو له‌کاغه‌زێکی سپی) .

(ئه‌وه‌ بوو له‌سه‌ره‌تای مانگی ته‌ممۆزدا ، چه‌ند که‌سانێك هاتن و بردیان له‌وانه‌ کابرایه‌ك ناوی (صدیق کوێر) بوو ، به‌راستی نه‌مانزانی بۆ کوێیان برد ، یان چییان به‌سه‌رهێنا به‌ڵام ماوه‌یه‌ك به‌سه‌ر چوو دووپیاوی ئێرانی یان هێناو لای ئێمه‌یان به‌ند کردن ، خه‌ڵکی شاری (ره‌زائیه‌) بوون و ووتیان : ئێمه‌ ئاگامان له‌وه‌ بوو که‌ چۆن کابرایه‌کیان هێناو له‌ مه‌ملکه‌تی ئێمه‌یان کوشت دواتر که‌ گیران به‌ڕێکه‌وت له‌کاتی قسه‌کردن و باسکردنی تاوانه‌که‌ له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌ی که‌ ئێمه‌یان گرتبوو زانیمان که‌ ناوی فاخر بوو ، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و نهێنیه‌ ده‌زانین ، ئێمه‌یان گرت و زیندانیان کردووین .

د.ع ده‌ڵێ : پاش ماوه‌یه‌کی که‌م هه‌ردووکیان کوشتن و ژماره‌ی گۆڕه‌کانیان (٣٥ ، ٣٦) له‌ خه‌تی یانزه‌مینی گۆرستانی زیندانی رایات ، له‌دواتر د.ع سه‌رگوزشته‌ی دوارۆژه‌کانی مانه‌وه‌ی خۆی و براکانی فاخر مێرگه‌سوری ده‌گێڕێته‌وه‌و چۆن زۆر هه‌وڵی داوه‌ که‌ قه‌ناعه‌ت به‌کاك جوهری براکه‌ی بینی که‌ له‌ ١٩٧٤ فاخریان له‌ ئێران کوشتوه‌ ، ئه‌وباوه‌ری وابوو که‌له‌نێوان (١٩٧٢ ــ ١٩٧٣) کوشتویانه‌ ..

ئه‌گه‌ر چی ئه‌م زانیاریه‌ نویی یه‌ ، به‌ڵام هێشتا گرێ کوێره‌که‌ی

نه کردۆته‌وه ره‌نگه مه‌سعود بارزانی ، فه‌ره‌نسۆ حه‌ریری ، کریم سنجاری و عبد المهیمن بارزانی و ئازاد برواری و شکیب .. تد هه‌والی راستی ئه‌و رازه‌یان لا بێت ، چونکه ئه‌وان بڕیاره‌که‌ی مه‌لا مسته‌فاو بنه‌ماله‌یان جێ به جێ کردوه .

کوردستانی نوێ ، رۆژی دووشه‌ممه ۱۹۹۵/٥/۱٥ ژماره ۹۸٤ شالاو مێرگه‌سۆری

خه‌لۆ برادۆستی له‌ ناو ماڵی حه‌مه‌د ئاغا گه‌وره‌ ببوو، هه‌ر له‌ به‌ر ئه‌وه‌ به‌ کوڕی خۆی ده‌زانی و کوره‌کانیشی به‌ برای خۆیانیان له‌ قه‌ڵه‌م ده‌دا، کوشتنی خه‌لۆو شوێن بزرکردنی، ئه‌ڵقه‌یه‌کی تری وونه‌، له‌ تراجیدیای قه‌تلوعام کردنی بنه‌ماڵه‌ی مێرگه‌سۆری.
کوشتنی خه‌لۆ برادۆستی به‌و شێوه‌یه‌ی که‌ «د. سلێمانی» ده‌گێڕێته‌وه‌ مه‌گه‌ر له‌ له‌قته‌یه‌کی سینه‌مایی به‌ رچاو بکه‌وێ.
«نووسه‌ر»

* * *

من و دوو زیندانی تر، له‌ مانگی ته‌مووزی ١٩٧٤دا بانگ کراین، پاش ئه‌وه‌ی چاویان به‌ستینه‌وه‌، «صدیق کوێرو هادی و ئازاد» که‌ پاسه‌وانی زیندان بوون سواری لاندرۆڤه‌ رێکیان کردین، پاش ئه‌وه‌ی سه‌یاره‌که‌ بۆ ماوه‌یه‌ك رۆیشت، له‌ شوێنێکدا وه‌ستاو دایان به‌زاندین و چاویان کردینه‌وه‌.. پیاوێکیان نیشان داین که‌ رووت و قووت بوو به‌ دارێکه‌وه‌ به‌سترابووه‌وه‌ و چاڵێکیش له‌ ته‌نیشتی یه‌وه‌ هه‌ڵکه‌ندرابوو ... به‌ر له‌ مردنی دۆشاوێکی زۆریان به‌ له‌شی دا کردبوو، که‌ تۆزێك لێی نزیك بووینه‌وه‌ چیمان بینی!! لاشه‌یه‌کی بۆن کردوو هه‌رچی زه‌رده‌واڵه‌ی ئه‌و ناوه‌ هه‌بوو له‌ له‌شی دا ئالابوون و ئاوسابوو.
صدیق کوێر، رووی تێ کردین ووتی: ئه‌مه‌ خه‌لۆ برادۆستی یه‌، له‌گه‌ڵ سه‌عیدی برای فاخر مێرگه‌سۆری خیانه‌تیان له‌ بارزانی کردووه‌، بۆیه‌ به‌و ده‌رده‌مان بردووه‌، ئێوه‌ش خه‌لۆ ببینن و دوارۆژی ئێوه‌ش هه‌ر وا ده‌بێ ...
پاشان به‌ چاو به‌ستراوه‌یی یه‌وه‌، جارێکی دیکه‌ ئێمه‌یان هێنایه‌وه‌ ژوور. تا رێگه‌که‌ی زیندانی رایات، به‌لام ئه‌وه‌ی که‌ هه‌رگیز له‌ یادم ناچێ و له‌ به‌رچاومدا وون نابێ ئه‌و له‌شه‌ په‌نماوه‌ی خه‌لۆ بوو که‌ قه‌ت له‌ له‌شی مرۆڤ نه‌ده‌چوو ...

---

* کوردستانی نوێ ١٩٩٥/٧/٣١ ژماره‌ ١٠٤٩ د. سلێمانی

# فه‌ره‌نسۆ ده‌یه‌وێ به‌ری رۆژ به‌بێژنگ بگرێ !

له‌به‌ر خاتری بنه ماڵه‌ی بارزانی فره‌نسۆ وه‌ك پیشه‌ی هه‌میشه‌یی ئاماده‌یه به‌رۆژی رووناك مێژوو بشێوێنێ وحه‌ق به‌ته‌رازووی ناحه‌ق بپێوێ و ناحه‌قیش به‌ته‌رازوی حه‌ق ، ئه‌گه‌ر نا شه‌هیدکردنی فاخیر مێرگه‌سووری و بنه ماڵه‌که‌ی به‌ده‌ستی بنه ماڵه‌ی بارزانی مشتومڕ هه‌ڵناگرێ و شتێکی روون و ئاشکرایه‌و سه‌رانی بارزانی حاشا له‌و راستیه ناکه‌ن و چه‌ند جار داوای پێکهاتنه‌وه‌و سولحیان له ماڵی فاخیر مێرگه‌سووري کردوه فره‌نسۆش له‌هه‌موو که‌سێك زیاتر ئه‌و راستیه ده‌زانێ ، به‌ڵام له‌و ناراستیه‌ی که‌له سه‌ر ته‌له‌فزیۆنی گوڵان رای گه‌یاندو خستیه پاڵ به‌رێز مام جه‌لال مه‌به‌ستی بوو ، دوو چۆله‌که به‌یه‌ك به‌رد بپێکێ و به‌به‌ردی یه‌که‌م ویستی خوانه‌خواسته دڵی بنه ماڵه‌ی فاخیر له ی.ن.ك بره‌نجێنێ و که‌چه‌ندین ساڵه دۆست و لایه‌نگری یه‌کێتی ی نیشتمانی ی کوردستانن ، به‌تایبه‌تیش دۆستی شه‌خصی مام جه‌لال‌ـن به‌به‌ردی دووه‌م ویستی پاکانه بۆ بنه ماڵه‌ی بارزانی بکاو واله‌خه‌ڵك بگه‌یه‌نێ که فاخیر له‌سه‌ر خیانه‌ت کوژراوه ، به‌ڵام هه‌موو خه‌ڵکی کوردستان ئه‌وه ده‌زانن که فاخیر کوردێکی دڵسۆزبوو و سه‌نگه‌ری کوردایه‌تی به‌هیچ شتێك نه‌ده‌گۆڕی یه‌وه‌و خاوه‌ن هه‌ڵوێست بوو و چه‌ندین داستانی وه‌کو داستانی چیای هه‌ندرێن ی تۆمار کردوه‌و جێ ی متمانه‌ی خه‌ڵك بوو هه‌ر بۆیه‌ش بنه ماڵه‌ی بارزانی مه‌ترسی ئه‌وه یان لێ کرد که جێ یان پێ له‌ق بکاو به‌بیانووی (خیانه‌تو خیانه‌تکاری ! !) شه‌هیدیان کرد . جگه له‌وه‌ش بنه ماڵه‌ی بارزانی نایانه‌وێ هیچ که‌سێکی بارزانی وازله‌ته‌کیه‌ی ئه‌وان بێنێ و سیاسه‌ت بکاو خۆی به‌شت بزانێ ، چونکه بۆده‌سه‌ڵاتی بنه ماڵه‌که ، و دواڕۆژیان زه‌ره‌ره . ئه‌گه‌ر فاخیریش پیاوی رژێم بوایه ! ! پێویست بوو له‌پێش جه‌ماوه‌ر گولله باران بکرایه ، ئه‌وکات هه‌موو خه‌ڵکی کوردستانیش ئافه‌رین و ده‌ست خۆشیان لێ ده‌کردن ، به‌ڵام له‌ترسی رقی جه‌ماوه‌ر ئێستاش له‌سه‌رانی بارزانی بترازێ که‌س نازانێ فاخیر چۆن شه‌هید کرا ، ئایا ده‌رخواردی گورگیان دا یان به‌زێ یان دادا.. گریمان فاخیر تاوانبار بوو ، باشه بۆ بنه ماڵه‌که‌یان دوای ئاش به‌تاڵ به‌شێوه‌یه‌کی دوور له‌ره‌فتاری ئیسلام و به‌نهێنی

قه‌تل و عام کران ، دوای ئه‌وه‌یش که‌ سه‌رانی بارزانی باره‌گه‌یان پێچایه‌وه‌ بۆ ئێران ، ژن و منداڵه‌کانی حمه‌د ئاغا به‌ ئاقار که‌وتن و پاش چه‌ند رۆژێك توانیان جگه‌ له‌ فاخیرو سه‌عیدی برای هه‌موو ته‌رمه‌کانی تر له‌ ناو خه‌نده‌کێك بدۆزنه‌وه‌ ، یه‌کێك له‌وان که‌ جه‌وهه‌ری برای فاخیر بوو ده‌فته‌رێکی بچووکی له‌ ناو گیرفان بوو تاچه‌ند سه‌عاتێك پێش شه‌هید کردنیان هه‌موو رووداوه‌کانی تێدا نووسیبۆوه‌ . بۆ زیاتر روون کردنه‌وه‌ی ئه‌م راستیه‌ نووسه‌ری کتێبی (سێ ساڵ خه‌بات و وڵاتێکی وێران) که‌ زۆر له‌ نزیکه‌وه‌ ئاگاداری ئه‌و رووداوانه‌ بوو . له‌ کتێبه‌که‌یدا ده‌ڵێ :(ئه‌گه‌ر فاخیر مێرگه‌سۆری تاوانباره‌ بۆ هه‌موو بنه‌ماڵه‌که‌ی ده‌کوژرێن ، وه‌ ئه‌گه‌ر دوژمنایه‌تی یه‌که‌ش عه‌شیره‌تی یه‌ نه‌ده‌بوا فاخیر بکوژرێ ، چونکه‌ ئه‌ندامی سه‌رکردایه‌تی پارتی بوو) .

له‌ هه‌موش سه‌یرو سه‌مه‌ره‌تر ئه‌وه‌بوو کاتێ فه‌ره‌نسۆ له‌ سه‌ر شاشه‌ی ته‌له‌فزیۆن ده‌ستی له‌ سنگی خۆی ده‌داو ده‌یگۆت ئه‌مه‌ حه‌قیقه‌ته‌ ، ئه‌مه‌ مێژووه‌ ده‌بێ بیلێین ده‌یگوت : من زۆر براده‌ری فاخیر مێرگه‌سوری بووم و براده‌ریه‌تی ئه‌ویشم زۆر پێ خۆش بوو ، فه‌ره‌نسۆ راست ده‌کا فاخیرو چه‌ندان براده‌ری له‌ فاخیریش (خۆشه‌ویست) تری ژێر گڵ کردن ته‌نها بۆ ئه‌وه‌ی ئافه‌رینێك له‌ سه‌رانی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی وه‌ربگرێ .

٢

---

٢ كوردستانی نوێ ، رۆژی هه‌ینی ١٩٩٥/٢/١ ژماره‌ ٩١١ ، ع. بارزانی

## ئه‌مجاره‌یان سه‌یره که‌لای فه‌ره‌نسۆیه‌!

رۆژ به‌رۆژ قسه‌ی سه‌یرتر له‌ فه‌ره‌نسۆ حه‌ریری ئه‌بیستین ئاخرین قسه‌ی ئه‌وه‌یه‌ که‌ده‌یه‌وێ کوشتنی فاخر مێرگه‌سوری بخاته‌ ئه‌ستۆی مام جه‌لال سکرتێری گشتی «ی.ن.ك» که‌گوایه‌ فاخر ده‌ستی له‌گه‌ڵ رژێمدا هه‌بووه‌.

فه‌ره‌نسۆ نازانێ به‌چ شتێك رووی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی سپی بکاته‌وه‌، بۆیه‌ هه‌موو تاوانه‌کانی ده‌خاته‌ ئه‌ستۆی یه‌کێتی نیشتمانی کوردستانه‌وه‌. به‌ڵام حه‌قیقه‌تی ئه‌م رووداوه‌ لای هه‌موو خه‌ڵکی ئاشکرایه‌و ناتوانرێ به‌هیچ شێوه‌یه‌ك به‌قسه‌کانی ئه‌و داپۆشرێ. قسه‌کانی فه‌ره‌نسۆ زۆر پرسیار هه‌ڵده‌گرن:-

- ئایا له‌ساڵی ١٩٥٨دا وه‌ختێك مه‌لا مسته‌فاءبارزانی فه‌رمانی کوشتنی فاخیری ده‌رکرد ئه‌و کاتیش مام جه‌لال‌بوو گوتی که‌ فاخیر ده‌ستی له‌گه‌ڵ رژێم دا تێکه‌ڵ بووه‌؟!

یان نیازی کوشتنی هه‌ر له‌مێژه‌ له‌ئارادا بووه‌؟

خۆ ئه‌و کاته‌ فاخیر سه‌رکرده‌یه‌تی هێزی به‌رگری میلی شیوعیه‌کانی ده‌کردو واته‌ شیوعی بوو نه‌ك پیاوی رژێم، ئه‌ی نێوان مه‌لا مسته‌فاو شه‌هید جه‌مال حه‌یده‌ری له‌سه‌ر ئه‌وه‌ تێك نه‌چوو؟

بارزانی به‌شه‌هید جه‌مالی راگه‌یاندبوو ده‌بێ فاخیر بکوژرێ.

هه‌ر بۆ خۆپارێزی له‌م هه‌ره‌شه‌یه‌ فاخیر به‌ناچاری خه‌ریکی کاری نهێنی حزبی بوو له‌م ماوه‌یه‌شدا چه‌ندین جار به‌ند کراو، له‌ساڵی ١٩٦٦دا له‌شه‌ری هه‌ندرێن به‌شداریه‌کی چالاکانه‌ ده‌کات.

زۆر له‌نوسه‌ران و رۆژنامه‌نوسانی ئه‌وروپاش له‌سه‌ر رۆڵی جوامێرانه‌ی فاخیریان له‌م شه‌ره‌دا نووسیوه‌. بۆ نمونه‌ رێنیه‌ مۆریس - که‌نووسه‌رێکی فه‌ره‌نسی‌یه‌ له‌کتێبی «کوردستان یان نه‌مان» چاپی ستۆکهۆلم ١٩٨٦ لاپه‌ره‌ ١٢١،١١ ده‌ڵێ:

«فاخر رووخۆش و به‌ژن و بالابه‌رزو چوارشانه‌، ئه‌وکات بره‌ ردێنێکی به‌ردابووه‌و له‌ (کاسترۆی) ده‌کرد سوێندی خواردبوو که‌نه‌یتاشێ تا سه‌رکه‌وتن»، له‌کۆنگره‌ی هه‌شته‌مدا فاخر گه‌یشته‌ ئه‌ندامێتی کۆمیته‌ی ناوه‌ندی پارتی، پاشان به‌رپرسیاری لقی چواری سلێمانی و که‌رکوکی پێدرا پاشان له‌لایه‌ن بنه‌ماڵه‌ی بارزانی گیرا»، هه‌ر ئه‌و گیرانه‌ بوو له‌ساڵی ١٩٧١ تاکو ئێستاش ته‌رمی نه‌دۆزراوه‌ته‌وه‌.

زۆر لە نووسەرانی کوردیش باسی ئەو حەقیقەتەیان کردووە، بۆ نموونە د.جەمشید حەیدەری لە کتێبی «چەند لاپەڕەیەك لە بیرەوەرییەکانم ل ١٩٤٩ ــ ١٩٦٦» کە لە ساڵی ١٩٩٣ لە ستۆکهۆلم چاپ کراوە، «ل٧٧ــ٧٨»، دەڵێت :

«ئەگەر فاخیر بەوە تاوانبار بکەن کە پیاوی بەعس بووە، ئەی حەمەد ئاغای مێرگەسوری کە خاڵی بارزانی بوو بۆ گوللە بارانیان کرد». هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بۆچی رشید، سەعید، جەمیل، ئەسعەد، جەوهەر، نزار، خەلیل، خەلۆ، مەجید، کوڕانی حەمەد ئاغای مێرگەسوری کوژران؟

ئایا حەمەد ئاغای مێرگەسوریش کە تەمەنی ٨٣ ساڵ بوو بەعسی بوو ؟

هەموو کەسێك دەزانێ ژیانی خۆی لە پێناوی کوردایەتی بەخەرج داوە و کۆماری مهابادو لوتکەکانی سەفین و زۆزك و هەندرێن شاهێدی خەباتی ئەوو کورەکانیەتی.

ئەی هەر حەمەد ئاغای مێرگەسوری نەبوو کە حوسێن ــی کوڕی کردە قوربانی بارزان و نەیهێشت بەعس بەرەو بارزان پێشرەوی بکات، ئەی هەر حەمەد ئاغا نەبوو کە چەندین جار لە سەردەمی پاشایەتی دا حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو ؟ ئەگەر فەرەنسۆ ئەو قسانەی خۆی «مەبەست لەو دیمانەتەلەفزیۆنیەی گولاَن بوو کە لە شەوی ٣\٤/٢/١٩٩٥ لەگەڵ فەرەنسۆ حەریریدا سەبارەت بە فاخیر مێرگەسوری و بنەماڵەکەی ساز کرابوو ».

بە حەقیقەت دەزانێ ئەی بۆچی لە حەفتاکاندا بۆ خەڵکی کوردستانی روون نەدەکردەوە تاوەکو چارەنووسی ئەو قەتڵ و عامەی کە دەرهەق بە بنەماڵەی مێرگەسوری کراوە نەبوایە بەتەلیسم؟

ئەی پاش ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ قەتڵ و عامەکەیان لە دژی ئەو بنەماڵەیە تەواو نەکرد ؟

بەڵگەیەکی تر لەم بارەیەوە یاداشتەکەی جەوهەری برای فاخیر کە نووسیویەتی :

بۆ ئاگاداری من و براکانم کوژراین لەساڵی ٢٢ــ١٩٧٥/٣/٢٣ واتە پاش ئاشبەتاڵ قەتڵ و عام کران .

ئەگەر بنەماڵەی حەمەد ئاغا دەستیان لەگەڵ رژێمدا هەبوایە بۆ تاساڵی ١٩٧٥ چاوەڕوانیان دەکرد، خۆ دەیان توانی دوای گیرانی فاخیر لەساڵی ١٩٧١دا خۆیان لەچنگ بنەماڵەی بارزانی ڕزگار بکەن و بچنە لای حکومەتی بەغداو پلەو پایەش بەدەست بهێنن، هەروەك چۆن عبیداللەو صابرو لوقمان و شێخ عوسمان و عیمادو نەزیرو چەندین لەکوڕەکانی بنەماڵە خۆیان تەسلیم بەڕژێم کرد.
لای هەموو کەسیش ئاشکرایە کەبراکانی مەسعود بوون دەستیان لەگەڵ ڕژێم تێکەڵ کرد نەك بنەماڵەی مێرگەسوری.
هەر بنەماڵەی بارزانی بوو دەستیان لەگەڵ ئێران و عیراق تێکەڵ کرد تا ئاش بەتاڵیان بە شۆڕشی کورد کرد نەك بنەماڵەی مێرگەسوری!!

---

کوردستانی نوێ، ڕۆژی سێشەممە ١٩٩٥/٢/٧ ژمارە ٩٠٨

# زنجیره‌یه‌ك بۆ یادی فاخر مێرگه‌سۆری

کتێبی (بارزان و ره‌چه‌ڵه‌کی بارزانیان) به‌ده‌سته‌وه‌بوو، ئیشاره‌تم لای هه‌ندێك هه‌ڵه‌دانابوو، به‌تایبه‌تی له‌باس و ناوه‌کانی بنه‌ماڵه‌ی شه‌هید حه‌مه‌د ئاغای مێرگه‌سووریدا، که‌له‌(مسلسلة)کانی فره‌نسه‌تۆمه‌ حه‌ریریدا گوێم له‌و بوختانه‌ گه‌وره‌یه‌بوو، که‌فره‌نسۆبه‌ده‌م مام جه‌لاله‌وه‌ کردی. له‌به‌ر هێندێ دیمه‌ سه‌ر ئه‌و باسه‌یی هه‌ڵه‌و بوختانه‌کان راست ده‌که‌مه‌وه.

خاوه‌نی کتێب له‌باسی کوشتنی برای شه‌هید فاخیردا واپیشان ده‌دات که‌ئه‌و کوره‌ی حه‌مه‌دئاغا که‌له‌هه‌ولێر کوژراوه، جه‌وهه‌ر بووه‌و هه‌ندێك قسانیش ده‌ده‌نه‌ پاڵ حوسێنی حه‌مه‌دئاغا که‌وانووسه‌ر له‌پرسه‌ی جه‌وهه‌ردا گوتوویه‌تی: ناوی ئه‌و که‌سه‌ هه‌ولێری یه‌شی به‌ره‌فعه‌ت نووسیوه‌ که‌ئه‌و کوڕی حه‌مه‌دئاغای کوشتووه.

جارێ ئه‌وه‌ی له‌هه‌ولێر کوژرا (جه‌میل)ی کوڕی حه‌مه‌دئاغابوو، جه‌وهه‌ر نه‌بوو، جه‌وهه‌ر له‌وکاته‌دا مابووو دوایی له‌گه‌ڵ هه‌موو بنه‌ماڵه‌که‌یدا کوژرا. هه‌رچی حوسێنه‌ ئه‌وه‌ له‌ساڵی ١٩٦٣ له‌دیفاع ـ کردن له‌خاکی بارزان دا شه‌هید بوو. ئه‌وه‌ش که‌جه‌میلی کوشت یا له‌سه‌رکوشتنی جه‌میل کوژرایه‌وه‌ ئه‌وه‌ رۆوف ناوێك شۆفێرێکی هه‌ولێری بوو، مه‌سه‌له‌ش به‌پێی زانینی من به‌م جۆره بوو:

«جه‌میل» ئه‌ندامی حیزبی شیوعی عیراق بوو، واده‌زانم گه‌یشتبووه‌ لیژنه‌ی محه‌لیی هه‌ولێر، به‌وه‌ی زانیبوو که‌هه‌ندێك له شێخه‌کانی بارزان پاش ١١ی ئازار به‌ئاگاداری و ده‌لالیی (فره‌نسۆ تۆمه‌ی) که‌وتۆته‌ جووله‌که‌ ده‌رباز کردن به‌ره‌و ئێران. ئه‌وجووانه له‌به‌غدا مابوونه‌وه‌ نه‌یانده‌توانی بگه‌نه‌ ئیسرائیل، له‌ئێرانی راده‌ چوونه‌ ئیسرائیل. ئه‌و شێخه‌ بارزانیانه‌ پاره‌یان له‌و جووانه وه‌رده‌گرت و بۆ فره‌نسو تۆمه‌ی هه‌م پاره‌و هه‌م په‌یوه‌ندی مۆسادو هه‌م تازه‌کردنه‌وه‌ی خزمایه‌تی، چونکه‌ خه‌ڵکی هه‌ریر ده‌ڵێن:

فره‌نسۆ تۆمه‌ی له‌و ئاسووریانه‌ نی‌یه‌ که‌له‌جووله‌مێرگێ‌یه‌وه هاتوونه‌ته‌ هه‌ریر، به‌ڵکو له‌و چه‌ند ماڵه‌ جووه‌ی هه‌ریرن که

بوونه مه سیحی .
جا (جه میل) له رێگه ی که سێکی حیزبه که یه وه یا خۆیه وه وتبوویان ئه و خه به ره ی گه یاندبووه به عسی یه کان ، که ئه وده می هه م (به ره)یان له گه ڵ حیزبی شیوعی هه بوو ، هه م له گه ڵ پارتیشدا له جه ژنی به یاننامه ی ئازاریدا بوون . بۆ فره نسو تۆمه ش هه م قایمقامی چۆمانێ بۆو ، به پشتێنی پارچه که ی به یداغی ئه مریکای تێدابوو ده چوو به پیر وه زیره کانی پارتی یه وه و له پاراستنیش بوو . گوایا به ناویش (خه تی مائل)ی حیزبی شیوعی بوو له پارتیدا .
که ئه مه زانرا پاراستن فرمانی کوشتنی جه میلی حه مه د .ئاغای ده رکرد ، فه ره نسه تۆمه هاته هه ولێری و له رێگه ی وه رزشکاره کانی ئاشنایه وه شتێکی رێك خست و به (جیب)ێك که ئه و (رؤوف)ه شۆفێری بوو له ناو هه ولێردا جه میل کوژرا . رۆژانی ئه وه ی رۆژنامه ی (التاخی)وای ده نووسی که وه ك خالۆزای مه لا مسته فای به ده ستی حکومه تی کوژرابێت . به ڵام فاخیر له جێ ی وه ی بچێته مێرگه سووری بۆ پرسه ی چووه هه ولێرێ و له وێنده رێ گه راو (رؤوف)ی گرت و ئیعترافی پێکرد ، ئه و جا چووه مێرگه سووری .
مه لامسته فا بۆ خۆی و کورانی له پرسه ی بوون و فره نسه تۆمه ش له به ر ده رگای ده وه ستا . فاخیر به ئیدریس بارزانی گوتبوو : خودا ئیوه ی کردیته گه وره ی ئه و میلله ته ی ، ده نا ئێ وه ی نه بوون بتوانن له مه بکوژن ، حه مد ئاغاش به مه لامسته فای گوتبوو : ئه گه ر کوری من جاسووس بوو به خۆمت بگوتبا هه که نه م کوشتایه پیاو نه بووم ، به ڵام بۆ خۆتان شه رم بوو خالۆزای تو له ناو جاده ی هه ولێرێدا بکوژرێ و بێ ناز بکه وێت .
پاش ماوه یه ك ئه و رؤوفه ده چێته گه ڵاله سه عیدی حه مه ئاغا ده یبینێت و خۆی پێ ناگیرێت ، ده ست ده داته کلاشنکۆف و ده یکوژێت و هه ربه و مارسیدسه ی مه لا مسته فا دابووی به فاخیر یه کسه ر رووده کاته بارزان و له لای شێخ عوسمان ده مێنێته وه .

---

کوردستانی نوێ ، رۆژی پێنج شه ممه ۱۹۹۵/۲/۲ ژماره ۹۲۸ م . بله یی

ئه‌گه‌ر فاخر مێرگه سوری ، به‌ پیاوێکی ژیرو کارامه‌و به‌ئاگا ، له‌دنیای سیاسه‌ت ناسراو بوبێت و پێشمه‌رگه‌یه‌کی بوێرو خاوه‌ن بیرو رایه‌کی پێشکه‌وتوخوازو شه خصیه‌تێکی به‌هێز، ناوی ده‌ر کردبێت . ئه‌وا جه‌وهه‌ری برای روناکبیرێکی ئازاو نووسه‌رێکی چاك و خاوه‌ن سه‌لیقه‌یه‌كی ئه‌ده‌بی و هونه‌رمه‌ندێکی شێوه‌کاری سروشتی به‌توانا بووه .

ئه‌و یادداشت و ده‌ست نووسانه‌ی جه‌وهه‌ر حمد ئاغا به‌راستی شه خصیه‌تی ئه‌و که‌له‌ پیاوه‌ به‌دیارده‌خه‌ن و تیشك ده‌خه‌نه‌سه‌ر وزه‌و توانای له‌بن نه‌هاتوی ئه‌و شه‌هیده‌ی ، که‌ره‌نگه ئێستا مابوایه . به‌خامه‌ ره‌نگینه‌که‌ی و به‌بیرو بۆچوونه‌ دروست و به‌لێکدانه‌وه سیاسیه‌ واقیعه‌کانی رۆڵێکی کاریگه‌ری ده‌بوو .

مخابن ... ئه‌و لاوه‌ به‌توانایه‌ له‌ هه‌ره‌تی تواناو پڕ ئیمکانیاتدا هه‌روه‌کو چه‌ندین روناکبیری تری کورد به‌ده‌ستی خوێناوی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی شه‌هید کراو کاروانی پڕ له‌هیواو ئاواته‌ گه‌وره‌کانی له‌نیوه‌ی رێگادا به‌جێ هێشت .

نووسینه‌کانی بریتین له‌مانه : (فرمێسك و برین ، یادداشتنامه‌یه‌کی ١٦٧ لاپه‌ره‌یی که‌ باسی سه‌رده‌می ده‌ست به‌سه‌ری و زیندانی خۆی ده‌کات له‌زیندانی رایات و خه‌لان و تیایدا وردوودرشتی تێبینیه‌کانی خۆی ده‌رباره‌ی رووداوه‌کان و ره‌فتاره‌کانی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی و ئه‌و ئه‌زیه‌ت و ئه‌شکه‌نجانه‌ی که‌ بینیویانه ده‌خاته سه‌ر کاغه‌زو تۆماری کردوون، (دیسان به‌نديخانه‌)یادداشتننامه‌یه‌کی‌کورته‌ له‌ ده‌فته‌رێکی بچوکدا له‌ ١٨ / کانونی یه‌که‌می ساڵی ١٩٧٥ نوسیویه‌تی له‌شه‌وی ٢٢\٢٣/٣ کۆتایی پێ دێت و باسی دوازۆژه‌کانی ژیانی خۆی و براکانی ده‌کا ، به‌رله‌وه‌ی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی ئه‌و تاوانه‌ گه‌وره‌یان ده‌رهه‌ق ئه‌نجام بده‌ن ، ده‌فته‌رێکی (٤٣) لاپه‌ره‌یی که‌ له‌ ١٩٧١/٩/٢٢ له‌زیندانی رایات ده‌ستی پێ کردووه ، بریتیه‌ له‌ تۆمارێکی دوورو درێژی

بەرنامەی بەناوبانگی ئەوساکەی رادیۆی «BBC» عەرەبی ، (السياسة بين السائل والمجيب) ، کە هەموو ئەو پرسیارانەی دەربارەی کێشەکانی جیهان و رۆژهەلاتی ناوەراست کراون لەدووتوی ئەم دەفتەرەدا تۆماری کردوون ، دەکرێ وەك مادەیەکی ئەرشیفی گرنگ و فەرهەنگێك سوودی لێ وەربگیری ، دەفتەرێکی (۳۰) پەری کە بەداخەوە هەندێکی فەوتاوە ، وەك کە شکۆلێکی ناسك، دەروون پاکی و هەست ناسکی و رووناکبیری و زمانزانی ژ جەوهەرمان بۆ بەدیاردەخا.

**لەلقەی یەکەم** *

«فرمێسك و برین» چیرۆکێکی ۱۷۳ لاپەرەیە و بەتابلۆیەکی جوانی فلچەکانی خودی کاك جەوهەری جوانەمەرگ رازاوەتەوە ، کە ژنێکی جوان، بەجل و بەرگی کوردی و چاوبەفرمێسکەوە مێردەکەی جێ دێلێت و خودا حافیزی لێ دەکات ، پاش ئەوەی مێردەکەی بریار دەدا ببێتە پێشمەرگەی کوردستان .

لەپێشکەش کردنەکەیدا نوسیویەتی :

پێش کەش بەو پێشمەرگەی ژیان و گیانی لەدەست دا بۆ ئازادی خاکی کوردستان

بۆ سەربەستی گەلی کورد

بەزەردەخەنەی بەختیاری کە ماڵئاوایی لە ژیان کردوو دەستی لەملی دایکی نیشتمان کرد .

بۆ ئەوخوشکەی هاوبەشی لەژیان و فرمێسك دەکا

بۆ هەموو لاوی کورد پێشکەش بێت ئەم چیرۆکە

هەروەکو لەلاپەرەی یەکەمدا دیارە لە ۱۹۷۲/٤/۱، دەستی بەنووسینی ئەم چیرۆکە کردووەو لە ۷۲/۸/۱۹\۱۸ لە بەندیخانەکانی رایات و خەلان ــ ی بارزانی نووسیویەتی و تەواوی کردووە.

چیرۆکەکە ۲۵ بەشە، رووداوەکانی دەگەرێتەوە بۆ ساڵانی ۱۹٦۱ ، ۱۹٦۲ ، ۱۹٦۳ سەرتا باسی دەست پێ کردنی شۆرش دەکا ، بەلام رەخنەش لەچۆنیەتی هەلگیرساندنی شۆرشی ئەیلول دەگرێ و دەلێ :

«بەنارێکی ... بەبێ نەخشەو پلانی ئامادەکراو بەبێ لێکدانەوەی

ئه نجام و ته مه نی شۆرش .. به بێ تاکتیك و ستراتیژی دوورونزیك به بێ ره چاو کردنی ... هتد» .

«ئه گه ر چی ده ڵێ .. گرنگ ئه وه یه ناوی لێنرا شۆرش و کورد ده ستی دایه چه ك به ڵام کام چه ك؟ چه کی بیروڕا یان چه کی کوشتن و برین».

ڕووداوه کانی چیرۆکه که ی له ناوچه ی سپێنداره ی سه ر به مێرگه سۆره، سه ره تا باسی ڕاکردنی خه ڵکی ئه و دێ یه ده کات که چۆن له ترسی فرۆکه و هێرشی دوژمن ده چنه چیاو دێ یه که یان ده سووتێ . به زمانێکی کوردی پاراو ، به وه ستاییه کی نموونه یی و که م هاوتا ، کاره ساتی ڕاکردنه که له گه ڵ سه ختی سروشتی کوردستان ده به ستێته وه و ئاوێته یه کی جوانی داوه ته ڕسته جوان و پڕ ماناکانی . به شێوه یه کی لێهاتوویی و زانایه نه ، که پێده چێ سوودی له گه وره نووسه رانی جیهان وه رگرتبێ له گه رمه ی ئه و کاره ساتانه ی که باسیان ده کا ، (سه ردار)ی پاڵه وانی چیرۆکه که ی به دیار ده خات و به باك گراوندێکی ئه ده بی یه وه ، خوێنه ر ده باته ناو ئه و عیشق و خۆشه ویستی یه ئه فسانه ی یه ی که له نێوان (سه ردار) و (خانزاد)دا هه یه و نموونه ی پاکی و بێ گه ردی خۆشه ویستی دێ و ناوچه شاخاویه کانی کوردستان به وه سفێکی جوان و له ڕێگای سه دان ڕسته ی قه شه نگ و وشه ی کوردی پڕ مانا ، تابلۆی سه ره کی چیرۆکه که ی پێ ده ڕازێنێته وه. ماوه یه کی دوورو درێژ خوێنه ر له مه ینه تی ڕاکردنی خه ڵکی دێ یه که ، دوور ده خاته وه و ده یباته ناوده ریای بێ بنی عیشقی بێ گه ردی (سه ردارو خانزاد)ه وه ، به هه ستێکی ناسکی شاعیرانه وه ، له ڕێگای وه سفی ئه و عشقه خوداوه ندی یه وه ته زوو به له شی مرۆڤ دا دێنی و ڕه نگه ئه وه ی که له ژیانیدا عاشقی کچێکی جوان نه بوبێت و دڵداری نه کردبێ له گه ڵ ڕووداوه کانی چیرۆکه که و شه وانی ژووانی ئه م دوو عاشقه ، خۆی ده خاته چوار چێوه ی پاڵه وانی چیرۆکه که و (تقمص)ی شه خصیه تی سه ردار یان خانزاد ده کا.

شه هید جه وهه ر ... چونکه خۆشه ویستی کوردستان و نیشتمانه که ی له ناو دڵدا چه که ره ی کردبوو و کوردایه تی، ئه وینی ژیانی ڕۆژانه ی بوو ، له ساڵی دووه می شۆرشدا بڕیار ده دا ببێت

به پێشمه رگه و پێ له سه ر جه رگی خۆشه ویستی خانزادی خه ون و ئاواتی دابنێ و له حیوارێکی دوو لایه نه دا له جیاتی یه کتر له باوه ش گرتن و راموسانی به م شێوه یه قسه له گه ڵ خانزادی خۆشه ویسته که ی ده کا . (من وتۆ یه کترمان خۆش ئه وێ ، به ڵام ئه بێ نه ته وه و خاکی خۆمان خۆشتر بوێت ، من وتۆ سه ربه ست نین ئه گه ر نیشتمانمان ژێر ده سبتبێت) .

سه ردار ده بێته پێشمه رگه و ، خانزاد جێ ده هێڵێ ، به ڵام وه ك خۆی به ڵێنی پێ ده دا (له دڵی ئه ودا جگه له خانزاد که س جێگای نابێته وه) سه ردار هه روه ك چۆن له خۆشه ویستی خانزاد دا بێ گه ردو غه ل وغه ش بوو له خوشه ویستیه که ی بۆ پێشمه رگایه تیش به باوه ڕو بیروڕا بووو ئه وه نده ی باوه ڕی به فکرو بیروڕا هه بوو باوه ڕی به چه ك نه بووه . تراجیدیای سوتاندنی گونده کانی کوردستان و ده ربه ده ربوونی خه ڵکه که ی له ده به شه که ی چیرۆکه که ی دا، جارێکی دیکه سه رهه ڵده داته وه و له ئاکامی بۆردمانی فرۆکه کانی دوژمن . خانزاد بریندار ده بێ و پاش چه ند مانگێك سه ردار به سه ردان ده گه ڕێته وه ماڵه وه و له وێش به مه به ستی دیتنی خۆشه ویسته که ی به ره و هه واری (گه لی خه یلان) بۆ ماڵی مام حه سۆی باوکی خانزاد به ڕێ ده که وێ ، به ڵام پێش ئه وه ی به خانزاد شاد ببێته وه ، خانزاد ده مرێ و چیرۆکه که لێره کۆتایی پێ دێت .

****

به راستی شه هید جه وهه ر له سه بکی زمانه وانی و پێکه وه لکاندنی خۆشه ویستی سروشت و نیشتمان و خۆشه ویستی خانزادو سه رداروله وه سفی حاڵه ته کاندا ، زه مینه یه کی وا بۆ خوێنه ر دروست ده کا که له یه که م وشه ی چیرۆکه که یه وه تاکو دوا لاپه ڕه که ی به سه لیقه و تامێکی زۆره وه له گه ڵ یه که و وردو درشته کانی ڕووداوه کان یه کانگیر بێت و ئافه رینی بۆ نووسه ر بڵێ .

کوردستانی نوێ ، رۆژی هه ینی ۲۱/٤/١٩٩٥ ژماره ٩٦٨ جێگر مێرگه سۆری

**ئەلقەی دووەم :**

دووەمین دەستنوس ، لە یادداشت و دەفتەرەکانی جەوهەری حەمەد ئاغای مێرگەسوری ، کەلەم ئەلقەیەدا تیشکی دەخەینەسەر ، لە ١٩٧١/٩/٢٢ لەزیندانی رایات ، دەست پێ دەکات ، دەفتەرەکە ١٢٠ لاپەرەیەو هەموو پڕکراوەتەوەو بریتیە لە چاودێری کردنێکی وردی بەرنامەی (السیاسه بین السائل والمجیب) کەوا بزانم هەموو رۆژی یەك شەممەو سێ شەممە لەرادیۆی لەندەنی عەرەبی ، پێشکەش دەکراو لەهەر ئەلقەی سێ پرسیار دەربارەی کێشە جۆراو جۆرەکانی جیهان وەلام دەدایەوە .

ئەم بەرنامەیە زیاتر لە ٣٠ ساڵ ، لەرادیۆی لەندەن پێش کەش دەکرا ، بەلام لەسەرەتای هەشتاکاندا بەرنامەکە نەماو لەگەڵ بەرنامەیەکی تردا لێك درایەوە . هۆی نەمانیشی ئەوەبوو کەبودجەیەکی زۆری دەویست ، چونکە ئەوانەی وەلامی ئەو پرسیارانەیان دەدایەوە ،، هەمووکار شوناسی ناسراوی ئەنستیتیۆو زانکۆو پەیمانگا ناسراوەکانی بەریتانیاو ئەمریکاو وولاتانی عەرەب بون .

ئەو بەرنامەیە ، سەرچاوەیەکی گرنگی نهێنی و وەلامی راستەوخۆو چڕوپڕی کێشەگەرمەکانی جیهان و هەموو کێشەکانی تر بوون ، ئەوکەسانەی کە گوێیان لێ رادەگرت ، ئەوانە بوون کە دەستیان لەسیاسەت دەداو حەزیان لەروناکبیری هەمەلایەنە (الثقافة الموسوعية) بوو .

جەوهەری جوانەمەرگ لەزیندانی رایات ، کاتی لە نێو زیندان بەفیرۆ نەداوەو جگە لە نووسینە تایبەتیەکانی خۆی ، وەك یادداشتنامەو شی کردنەوەی باروودۆخی کوردستان و چیرۆك نووسین ، ویستوویەتی لە رەوتی روناکبیری سیاسەتی جیهانیش دوانەکەوێت و لەهەموو کونج و بنەوانی کێشەکانی دنیا بگات . هەربۆیە بەسەلیقەو وردەکاریەکی زۆرەوە ،، زۆربەی ئەلقەکانی بەرنامەکەی ئینصات کردووەو ئینجا بەرێك و پێکی بە ئینشاو ئیملایەکی تەواوە خستویەتیە سەرکاغەزی دەفتەرەکەی و زۆربەی رۆژی بلاو کردنەوەی ئەلقەکانیشی یادداشت کردوەو پرسیارەکانی

• کوردستانی نوێ، پێنج شەمە ١٩٩٨/٤/٢٧ ژمارە ٩٧٣

نووسیونه ته وه ، ناوی ئه وکه سانه شی تۆمار کردووه که وه لامی پرسیاره کانیان داوه ته وه ، دوای ئه وه ی له خوێندنه وه ی ده فته ره که بوومه وه ئه و دوو تێبینی یه م لا دروست بوون .

یه ك : جه وهه ر حه مه دئاغا زمانی عه ره بی باش زانیوه و کۆنترۆڵی ته واوی به سه ردا هه بووه ، وه ئه گه ر چی کاره که ی بریتی بووه له گواستنه وه له سه ر کاسێت بۆ سه رکاغه ز ، به لام به ده گمه ن رێك ده که وێ که هه له یه کی زمانه وانی به سه رداتێ په ربوبێ .

دوو : له نووسینی یادداشته کانیدا ، به تایبه تی له سه ر به یاننامه ی ئازارو شۆرشی کوردو سیاسه تی پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانیدا ، کارتێکردن و ئه بعادی کێشه کانی جیهان، له وانه گوێ گرتنی له و به رنامه یه ره نگ ده داته وه و زۆر جاریش به نموونه ده یێنێته وه .

ده فته ره که ٤٢ پرسیاری سیاسی هه مه جۆری تێدایه و وه لامه کانیشی له ژێر هه ریه که له پرسیاره کان نووسیوه ته وه ، پرسیاره کان له سه ر ئه ومه سه لانه ن (کێشه کانی نێوان وڵاتان ، په یوه ندی سیاسی وڵاتان ، شه خصیات ، سیاسه ت و پول ، نه ته وه یه کگرتوو کان ، هۆی سه رنه که وتنی نه ته وه یه کگرتووه کان له چاره سه رکردنی زۆر له کێشه کان ، کوده تا سه ربازیه کان و هۆیه کانی ، شه ری نێوان وڵاتان ، مانای هه ندێك له ئایدیۆمی (مصطلح) سیاسی و چه ندین مه سه له ی تر) .

پرسیاره کان ده توانرێ به م شێوه یه پۆلین بکرێن :

- وڵاتانی عه ره ب ١٤ چوارده پرسیارو وه لام .
- ئه ورروپا ١٥ پانزه پرسیارو وه لام .
- نه ته وه یه کگرتووه کان ٤ چوار پرسیارو وه لام .
- ئاسیا ٤ چوار پرسیارو وه لام .
- پول و سیاسه ت ٣ سێ پرسیارو وه لام .
- ئه مه ریکا دووپرسیارو ئه فریقاش یه ك پرسیار

ئه و کارشوناسه ناسراوانه ی که وه لامی پرسیاره کانیان داوه ته وه و هه ندێکیان زۆر ناسراون که ئه مانه ن :

نیقل باربر رۆژهه لات ناس، جیمس تۆمسن نووسه ری سیاسی به ناوبانگی به ریتانیا که ئێستاش ماوه ، جۆن هارتك کارشوناس له

کاروباری ئه فریقیا ، ئیرك بومن له کارمه نده ی پایه به رزی ئیستگه ی له نده ن که دوکتێبیشی له سه ر کێشه ی فه له ستین هه یه ، دیڤید میتشن کارشوناس له کاروباری عه ره بی که هه میشه وه ڵامی ئه و پرسیارانه شی ده دایه وه ، که ده رباره ی کێشه ی کورد له به رنامه که ده کران وه چه ندین کارشوناسی تر .

زۆر جار وا رێککه وتوه که په راوێزی بۆ وه ڵامی پرسیاره کان داناوه و خۆی هه ندێك زانیاری خستۆته پاڵ وه لام دانه وه کان ، هه ربۆ نمونه له پرسیاری ٢١ دا که ده رباره ی عیراق و وڵاته عه ره بیه کانه و دیڤید میتشن وه ڵامی داوه ته وه و ناوی عبد الكريم الشيخلي ، وه زیری ده ره وه ی عیراق هاتووه و له په راوێزدا ده رباره ی ئه و شه خصیه ته عیراقی یه نووسیویه تی :( اعفي السيد الشيخلي من منصبه يوم ١٩٧١/٩/٨ وعين مندوبا دائما للعراق لدى الامم المتحدة واعفي معه السيد صالح مهدي عماش الذي كان نائبا لرئيس الجمهورية وعين في الوزارة الخارجية) .

وه هه روه ها له چه ندین وه ڵامی تریش تێ بینیه کانی خۆی تۆمار کردووه .

بایه خی ئه م ده فته ره له وه دایه که ده کرێ ، وه ك فه رهه نگۆکێکی بچوکی سیاسی ده رباره ی ئه و ٤٣ کێشه یه ی که به پرسیار هاتون و وه لامیان له لایه ن که سانی بێ لایه ن و کارشوناسی ناسراو دراونه ته وه ببێته ئه رشیف و هه رچ کاتێك مرۆڤ پێویستی پێ هه بێ بۆی بگه رێته وه ...

**ده فته ری سێیه م :**

گه رانی ئه مجاره مان به ناو ده ستنوسه کانی جه وهه ری حمه دئاغای مێرگه سۆری خوێندنه وه یه کی خێرای ده فته ری یه که می یادداشتنامه کانیه تی که له ١٦٧ لاپه ره پێك هاتووه و به زمانی کوردی تۆماری کردووه و له سه ره تای سالی ١٩٧٤ ه وه ده ستی به نووسینی کردووه وله دوای ئاش به تاڵه که ی ١٩٧٥ کۆتایی پێ دێت .

**به شی یه که م**

له و به شه دا که ٤١ لاپه ره یه و به دوورو درێژی و به شێوه یه کی زانستی و تێکه ڵ به سۆزو عاطفه یه کی کوردانه وه ، به زمانێکی رۆمان

ئاساوه، به یاننامه ی یازده ی ئازار هه لده سه نگێنێ و بیروڕایه کانی خۆی ده خاته سه ر کاغه زو لایه نه چاکه کان و خه راپه کانی حکومه تی به عس و سه رکردایه تی شۆرشی کورد ده خاته به ر لێزمه ی ره خنه وه . ره خنه یه کی هێمن و له سه رخۆ له سه ر کردایه تی شۆرشی ١٩٧٤ ده گرێت و ده ڵێ : ده بوایه له پێکهاته ی میری به عس تێگه یشتنایه و

ئه و چوار ساڵه یه به ماوه ی حه سانه وه ی میری و سوپاکه یان له قه ڵه م دابوایه و له به رامبه ردا چۆن ئه وان سوپایه کی به هێزو توانایان ئاماده کردووو په یونده ی عه سکه ری و سیاسیان له گه ل روسیادا چاك بوو ، ئێمه ش به پێ ی توانا .. له و ماوه یه دا ئیشمان بۆ خۆ کردبوایه و ده نووسێ : (ده بێ هه ر ئه وه نده دڵمان به و مفاوه زاته خۆش بێ تاکو به عسیه کان خۆیان ئاماده ده که نه وه و ده توانن به ته واوی ده سه ڵات به سه ر عیراقدا بسه پێنن ، چونکه به نیازێکی کاتی هاتۆنه ته پێشه وه ) .

هه روه ها گله یی له سه رکردایه تی شۆرش ده کات و ده ڵێ ، به داخه وه ئێمه ماهیه تی دوژمنانی خۆمان نه زانیوه ، (ئه وه نده ی دوژمن ئێمه ی ناسی ، ئێمه ئه وه نده ئه وَمان نه ده ناسی ) .

ئینجا باسی دوا تروسکایی ده کات که کوژایه وه و به یاننامه ی ئازاریش وه کو مفاوه زاته کانی ١٩٦٣ ، ١٩٦٤ ، ١٩٦٦ لول درایه وه و سه ری نه گرت ، به تایبه تی دوای گه رانه وه ی ئیدریس بارزانی له به غدا «١٩٧٤/١/٩» به ده س به تاڵی . جه وهه ر حمه دئاغا ... هه روه ك له نووسینه کانی به دیار ده که وێ پێ ده چێ زۆر ئاگای له باس و خواست و نهێنیه کانی شۆرشی ١٩٧٤ بوبێت و به وریایی زۆر لایه نی په یوه ندیه کانی خه ڵك و لێپرسراوان شی ده کاته وه و په نجه ده خاته سه ر هه ڵه گه وره کانی لێپرسراوانی شۆرش ، به تایبه تی ئه و تصریحانه ی که بۆ بانگه شی خه ڵك بوون ، بۆ هاتنه ناو شۆرش و به جێ هێشتنی مال و حالیان له شارو شارۆچکه کان و دیهاته کانی کوردستاندا .

هه روه ها له م به شه یدا مه ترسی خۆی له ته قدیراتی هه ڵه ، له رووی سیاسی و عه سکه ری به دیار ده خات و هیواش ده خوازی که سه رانی شۆرش له و مه سه له یه به ئاگا بن ، ئه گه ر چی هه رخۆیشی له سه ره تای نووسینه که یدا ، گله یی له بێ ئاگایی و ته سك بینی

سه رکردایه تی شۆرش ده کات له په یوه ندی کردن و تیروانینیان بۆ مه سه له کان و خوحه شاردانیان له گونجێکی ته سکی تاریکدا . چه وهه ر ئاغا له و به شه ی دا به زمانێکی ئه ده بی و پرترسه وه باسی ئه و لێشاوه ده کات که به ره و مه لبه نده ئازاد کراوه کان ده هاتن و به شێوه یه کی وه ستایانه ی بێ وێنه وه . به ده رچونیان بۆئێران و ره فتاره جه راپه کانی لێپرسراوه کان ده به ستێته وه ، به راوردی ئه وهیوایه ده کات که خه لکی به شۆرش به ستبووه و چۆن له سه ره تادا وایانده زانی ، پاش چه ند رۆژێك ده گه رێنه وه و «دوژمن به چی لێیان بدات به ئه و لێیان ده ده نه وه» فرۆکه ناتوانی به سه ر ناوچه ئازاد کراوه کان و باله ك بسورێته وه و ... تد و ئینجا تراژێدیای هه نه بجه و قه لادزێ و گه لاله، چۆن ئه و خه ونه ی سه راوژێر کردو چۆن ته سك بوونه وه ی بازنه ی ناوچه ئازادکراوه کان چه واشه یی قسه کانی سه رانی شۆرشیان بۆ خه لك به دیار خست .

**به شی دووه م**

له لاپه ره ٤٢ دا ده ست پێ ده کات ، هه روه کو خۆی ناوی لێ ناوه له (یاددنامه ی رۆژانه)ی خۆمدا به کورتی باسی زۆربه ی ئه و رووداوانه ده کات که له و ماوه یه دا روویان داوه و جاروباریش به خێرای شییان ده کاته وه .

بۆ نموونه : له ١١ شوباتی ١٩٧٤ میری طه شکرچی کرد به فه رمانده ی تیپی پێنجه م له هه ولێرو ده لێ :-(ناردنی ناوبراو بۆ شارێکی وه ك هه ولێرو کرانی به فه رمانده ی فرقه یه کی سوپا باشترین نیشانی نیاز خراپی به عسیه کانه) .

له باسی هاتوچۆی وه فدی پارتی بۆ به غداو هاتنی وه فدی حکومه ت بۆ باله ك ده لێ : له ٧-ی شوبات وه فدێك به سه رۆکایه تی (علي غنام)هاتنه باله ك هه روه ها ده لێ له ٢٤ / شوبات وه فدی کوردی به سه رۆکایه تی(حبیب فه یلی)گه رایه وه و وادیاره جارێکی دیکه ناچنه وه به غدا .

کاك چه وهه ری جوانه مه رگ زۆر به وردی له وماوه یه دا، که هێشتا وه کو خۆی ناوی لێ ده نێ (شه ری سارد)ی نێوان میری و شۆرش نه بوو به (شه ری گه رم) رووداوه وردو درشته کان و سه ردانی وه فده کانی به غداو وه فده کانی شۆرش تۆمار ده کات .

له گه رمه ی ئه و وه زعه شدا خۆی له بیرناکاو جینایه ته کانی بنه ماڵه ی بارزانی ده رهه ق خۆیان ده نوسیته وه و له ۲ ی نیساندا ده نوسی و ده ڵێ : ئه مرۆ دوای موافه قه ت کردنی باره گای بارزانی ، رێگا درا که (غاندی) کوڕم له به ر نه ساغی فتق و نه ساغی تر بینێرمه (خانه) بۆ لای دکتۆرو معالجه ، منیش له گه ڵ غاندی و دایکی چوم هه تا حاجی ئۆمه ران ، هه ڵبه ت قه ده غه بوو بۆ من بچمه خانه چونکه ده ست به سه ربووم و ده بوا له گوندی «ئازادی» ده رنه چم ، ته نها بۆ ئه و ده رروپشته نه بێت ، ته نانه ت قه ده غه بوو بچمه چۆمانیش .

له شه شی حوزه یراندا ، له چوار لاپه ره ی پڕ له مه ینه تی و ناخۆشیدا باسی گیرانی باوکی و حمید ئاوێك ده كاو به سه رهاتی چۆنیه تی به یه ك شادبوونه وه ی له گه ڵ باوكیدا به سه یره وه باس ده كات و ده ڵێ : چونكه ئێمه ده ست به سه ربوین ، دوای سێ ساڵ دابڕان له گه ڵ باوکم له به ندیخانه ی خه لان یه کترمان دیته وه .

به دوورو درێژی باسی گیرانی ئه مجاره ی خۆی و باوکی ده کا ، واپێ ده چێ سه رکردایه تی بارزانی زۆر له و بنه ماڵه یه ترسابێت چونکه له رۆژی گیرانیاندا تاکو ۷ ی ته مموز ، به بریاری محمد عزیز ـ ی باره گای بارزانی سێ جار پاسه وانه کانی حمه د ئاغاو کوره کانی گۆڕاون . واديارە له وه ترسابون نه وه ك بتوانن پاسه وانه كان رازی بکه ن و رابکه ن .

جه وهه ر سه ره رای وه زعی خه راپیشی ، به تایبه تی دوای گواستنه وه یان بۆ خه لان ، زۆر به لێهاتوویی و ژیرانه ، گه لێك له رووداوه کانی جیهانیشی له دوو توێی یادداشته که ی تۆمارکردوون ، ئه وه ی زیاتر سه ره نجی راکێشام ئه و باسه زانستیه یه که ده رباره ی له شکرکێشی تورکه کانه بو قوبرس که ۲۵ لاپه ره ی له سه ر نوسیوه و له رووی مێژوویی و سیاسی و سه ربازیه وه باس له رووداوه که ده کا ، هه روه ها زۆر به وردیش باسی له (وۆتر ـ گێت) کردووه .

بێ ئومێدی جه وهه ر به رامبه ر به بنه ماڵه ی بارزانی ده گاته ئه و په ریه وه کاتێ له ۲۰/تمووز/۱۹۷٤ هه واڵێکی نادروستی کۆچی دوایی سوار ئاغای کوڕی حمد امین ئاغای شێروانی پێ ده گا ، بۆیه په ناده باته به رخودای مه زن و ده ڵێ : (خودای گه وره ره حممان پێ بکات ، هێشتا چاره نووسی فاخری برام و سه عیدی برام و خه لۆی

پێشمەرگە دیارنی یە ، بێجگە لەوانە چەند ئامۆژاشم هەر لە بەندیخانەی رایات ــ ن ، من و باوکی پیرو بێ تواناشم واین لەخەلان دەست بەسەری توندو بێ حورم تین) .

واپێدەچێ هەوالە نادروستەکەی مردنی سوار ئاغای لەبەندیخانەی رایات زۆر کاری تێ کردبێ بەوەسفێکی پڕ لە غەم و حەسرەتەوە باسی ئەو کارەساتە دەکا ، بنەمالەی بارزانی بەشێوەیەکی وا کۆت و زنجیریان لەپێی بنەماڵەی مێرگەسوری کردبوو کەنەیان دەتوانی بەبێ ئەمری بارەگای بارزانی بستێک بجولێنەوە ،لە ٢٨ تەمووزدا سەربردەیەکی دوورودرێژ دەربارەی داواکردنی ئیجازە بۆخێزانەکەی بۆئەوەی سەرلەمالی براکەی بدا لەکرمانشاه بەگێرێتەوەو دەڵێ :(ماوەی سێ مانگ دەبێ من داوای ئیجازە دەکەم و بۆ منداڵە کانم کەچی تاکو ئێستا رێگایان نەداوە) پاش ئومید بڕی نامەیەك بۆ حمە عزیز دەنوسێ و ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ :

## برای بەرێز کاك جەوهەر

سلاوو احترام

کاکە مبدئیا موافقەت هەیە ، بەڵام پێویستم بەپرسیارێکی کاك مەسعود هەیە ،، ممکینە ئەمشەو یان سبەی شەو دەستم بیگاتێ وەخەبەرتان دەدەمێ .

ئیتر خۆشیتان
محمد عزیز
٧/٣١

سەیر لەوەدایە کێشەی ئیجازەکەی دوای ٣ مانگ سەرەنجام لە ٥ ی ئاب موافقەتی لە سەرکراوە ، بۆ ئەوەی خێزانەکەی بچێتە ئێران ، ئابەم شێوەیە رەفتاریان لەگەڵ دەکردن شەری دەروونیان لە بەرامبەدا ئەنجام دەدان . ئەوەش مشتێکە لەخەرواریك و بەسەدان خەڵکی تریش هەمان تالی و تفتی بنەماڵەی مێرگەسوریان چێشتووە .

لەدوا بەدوای مانگی تەمووز تاکو ٢٨/تشرینی یەکەم چونکە شەرلە نێوان کوردو حکومەتی مەرکەزی زۆر گەرم بوو ، هەر لەبەرئەوە پێ دەچێ کاك جەوهەریش کەوتبێتە ژێر کاریگەریتی

ئه‌و شه‌رانه‌و به‌دوورو درێژی شه‌ره‌کانی تۆمار کردوون و ئه‌نجامه‌کانیشی نووسی وه‌و دانی به‌وه‌ناوه که هێزه‌کانی حکومه‌ت له‌هه‌موو به‌ره‌کاندا هاتونه ته پێشه‌وه‌و له‌لاپه‌ره ١٥٠ دا کۆتایی به‌به‌شی دووه‌م دێت .

**به‌شی سێیه‌م**

ئه‌م به‌شه له‌لاپه‌ره ١٥١ ده‌ستی پێ ده‌کا، باسی که‌ش و هه‌وای شۆرش ده‌کات دوای رێکه‌وتنی جه‌زائیرو له‌چواری ئازاره‌وه تاکو مۆرکردنی و ئینجا تێکچوونی شۆرش و ئاش به‌تال پێکردنی به‌وردی شته‌کانی تۆمار کردووه . له ١٩٧٥/٣/١٩ دا کاك جه‌وهه‌ر ده‌نووسی : (شه‌وی رابردوو کۆبوونه‌وه‌ی ئامیر هێزه‌کان و ئه‌ندامانی ,لیژنه‌ی مه‌رکه‌زی و مه‌کته‌بی سیاسی و کاربه‌ده‌ستانی تر بو بارزانیش ئاماده بوو ... بارزانی له‌و قه‌ناعه‌ته‌بوو که شه‌ڕیان بۆ ناکرێ بۆیه گوتویه‌تی ئێمه شه‌رناکه‌ین وه‌داوایان له‌هه‌موو جه‌بهه‌کانی پێشمه‌رگه کردووه که دوو رێگایان له‌پێشه یان برۆنه‌ناو میری یان چه‌ك فرێ ده‌ن و برۆنه ئێران ) .

هه‌روه‌ها ده‌قی ئه‌و بروسکه‌یه‌شی نوسیوه‌ته‌وه که مه‌کته‌بی سیاسی بۆ حکومه‌ت وسه‌رکردایه‌تی به‌عس ناردوویه‌تی و که تیایدا داوای پارانه‌وه‌ولێبوردن؛ ده‌کاو ده‌قی وه‌لامی احمد حسن البکر ـیشی تۆمار کردوه که چۆن گالته به‌بروسکه‌که‌یان ده‌کات .

به‌مجۆره کۆتایی به‌ده‌فته‌ری یه‌که‌می یادداشته دوورودرێژکه‌ی کاك جه‌وهه‌ر دێت ، که پڕه له هه‌واڵ و کاره‌سات و ئه‌زیه‌ت و ئه‌شکه‌نجه‌ی خۆیان به‌ر له‌وه‌ی به‌ده‌سته جه‌معی رۆژی ١٩٧٥/٣/٢٣\٢٢ له رایات ئیعدام بکرێن ، ئه‌گه‌ر چی له‌لاپه‌ره ١٦٧ که‌دوا لاپه‌ره‌یه‌تی نوسیوه‌تی و ده‌ڵێ :

له سه‌عات ١,٣٠ ی ١٩٧٥/٣/١٩ ئێمه ئازادو بێ حه‌ره‌س ماینه‌وه پاش ئه‌وه‌ی هه‌موو شت کۆتایی هات و گره‌نتیشمان له‌مه‌سعود وه‌رگرت .

---

کوردستانی نوێ، رۆژی دووشه‌ممه ١٩٩٥/٥/١ ژماره ٩٧٦ جێگر مێرگه‌سۆری

ئه لقه ی چواره م

## دیسان به ندیخانه

به شێکه له یادداشته کانی جه وهه ر حمه د ئاغای مێرگه سوری که له ده فته رچه یه کی بچووك نوسیویه تی له ۱۸ ی کانونی یه که می سالی ۱۹۷۵ ده ست پێ ده کات و ۱۲ په ره ی یادداشتی تایبه تی خۆیه تی و زۆربه ی له سه ر مه سه له خێزانیه کانیه تی و له لاپه ره ۱۳ ه وه که له ۲۰ ی ئازاره وه نووسیویه تی و له ۲۲ ی ئازار ، واته یه ك رۆژ به ر له ئیعدام کردنی کۆتایی دێت و به ۱۱ لاپه ره باسی تراژیدیای ئه و سێ رۆژه ده کات که به ر له شه هید کردنی خۆی و براکانی له زیندانی رایات بینویه تی .

ده قی ئه و به شه له لایه کی تری ئه م کتێبه هه یه

**ده فته ری که شکۆل**

ئه م ده فته ره ۲۰ لاپه ره ده بێت واپێده چێ له راستیدا ۳۰ لاپه ر بووبێت ، به لام زۆربه ی لاپه ره کانی دراون و فه وتاون ، هه ندێك له په ره کانی تریشی به ئاوته ر بوون و شێ داریی به ته واوی کاری تێ کردووه .

له گه ل ئه وه شدا ، ئه وه ی که ماوه ده خوێندرێته وه، شایانی ئه وه یه که هه لوه سته یه کی له سه ر بکرێت .

وا پێده چێ ، له سه ره تای مانگی ده ی سالی ۱۹۷۲ له به ندیخانه ی رایات ده ستی به نووسینی ئه وکه شکۆله کردبێت و تاکو چه ند مانگێك دوای سالی ۱۹۷۳ هه ر له نووسینیدا به رده وام بووه .

نووسینه کان هه ندێکیان به زمانی کوردی و هه ندێکی تریش به زمانی عه ره بی و فارسی نووسیویه تی .

بریتیه له کۆکردنه وه ی په ندو قسه ی نه سته ق و حیکمه ت و به یته شیعری جۆراو جۆرو ته رجه مه کردنی هه ندێك شتی تر له لایه ن کاك جه وهه ر خۆیه وه له زمانی فارسی بۆ زمانی کوردی .

له و ده فته ره دا ده رکه وت که خوالێخۆشبوو شاره زایی له زمانی فارسیش هه بووه و ، ئه وزمانه ی خۆش ویستووه .

هه روه ها دل ته ری و ئاویزان بوونی له گه ل عیشق و

خۆشەویستی دا بە ئاشکرا لە نووسینەکانی نێو ئەو دەفتەرەدا دیاردەکەوێ ، ئەگەر چی زۆربەی قسەو باسەکانی کۆمەلایەتین و باس لە چاکەو پیاوەتی و ئامۆژگاری و سیفاتی بەجێی مرۆڤ دەکات، هەروەها نوکتەو قسەی خۆشیشی تێدایە .

لە ١٩٧٣/١/١ کاك جەوهەر سالی ١٩٧٢ بەم شێوەیە بەرێ دەکا :

بەدلێکی پرغەمو داخ و ئوفەوە سالی ١٩٧٢مان بەرێ کرد . بەبێ بەشنکردنمان لەروناکی ژیان و جیهان .. هەلبەتە سالی ١٩٧٢ش تەوقی دووەم بوو لە زنجیرە سالانی پرمەینەت و دەردەسەری و خەفەت کەلە سالی ١٩٧١ یەکەم بازنەی ئەم زنجیرە بوو ، وە ئومێدەوارم کە سالی ١٩٧٣ نەبێتە سێ یەم بازنەی ) .،

لە درێژەی وەزعی دووسالەی خۆیان لە بەندیخانەی بارزانی بەردەوام دەبێت و دەڵێ :

(ئومێدەوارم کە ناحەزو ناپیاوان دەستی بێ ئومێدی و فەشەل بەچاوی کوێریانەوە بگرن و سەتمە بکەن و لەوچال و کۆسپانەی لەسەر رێگای ئێمەیان دروست کردبوون بکەونە ناوی و تیایدا بخنکێن) هەروەها دەڵێ :

(هەرچەندە لەودووسالەی رابردوو وە لە پێشەوەتریش حەق لەژێر ناحەق نالەی دەهات بەلام هەرچەندە چەرخی رۆژگاریش بەچەپەوە بسورێت بێ گومان رۆژێ راستی هەردێتە پێشەوەو حەق بەدەست و بازووی بەهێزەوە توقی لەنابردن و نەهێشتن ئەخاتە ملی ناحەق و لەناوی دەبات ، وە چاك لەخەراپ جیادەکرێتەوەو دلسۆز لەناپاك ئاشکرا دەبێت و پاك لەناپاك دە پالێورێن و وەفاو بەنیەت دێتەروو وەگەلی کورد رۆلەی راستەقینەی خۆی دەدۆزێتەوەو لەفیلبازو ناپاك و درۆ فریوکاران رزگاری دەبێت).

هەروەها خوالێخۆشبوو پێشبینەکانی خۆی بۆ سالی ١٩٧٣ تۆمار دەکات و گرنگیەکەشی لەوەدایە کە :

پێشبینی شەرێکی نوێ ی عەرەب و جولەکە دەکات و دەڵێ عەرەبەکان هەندێك دەسکەوت بەدەست دێنن ، کە ئەم پێشبینیەشی هاتۆتەدی و لەبەرەی میسردا عەرەبەکان خەتی بارلیفیان شکاندو لە سویس پەرینەوە .، هەروەها پێشبینی

هه لچوونی په یوه ندییه کانی نێوان عێراق و ئێرانیش له جێ ی خۆی بووه .

سالی ١٩٧٣ یش به سالێکی ره ش بۆ نیکسونی سه رۆکی ئه وسای ئه مریکا له قه له م ده دا جگه له چه ند پێشبینی تر .

چه ند قسه یه کی تر

کاك جه هه ر ... مرۆڤێکی به هره مه ندو هونه رمه ندێکی لێهاتووبووه . زۆر جار له جیاتی ئه وه به خامه "آ" ره نگینه که ی ئه وه ی له ناخ و ده روونی دابوو . بڕژێنێته سه رکاغه ز . په نای بردۆته به ر شێوه کاری به فلچه ی ده ستیه وه سروشتی جوانی کوردستان و عیشقه به سۆزو گوره که ی بۆ ناوچه ی (شێروان) به تابلۆی سروشتی جوان که یرازانده وه و ده ردی دلی خۆی ده خسته چوار چێوه ی ئه وتابلۆیانه .

گه وره ترین ئێش که کاك جه وهه ر له و رووه وه به ئه نجامی گه یاندبێ تابلۆیه کی زله به ناونیشانی (بوکابێری) له یادداشته کانی دا له ٢٠ ی ته مووزی سالی ١٩٧٤ به م شێوه یه باسی ئه و ئیشه ی ده کا (تابلۆ زله که ی بوکابێری له مانگی ره مه زانی ١٩٧٣ ده ستم پێ کردووه ، به لام له به ر باری ئالۆزو گۆڕاوی ده روون و ژیان ده ستم زۆر لێ شل بوو به هه ر حال توانیم به هاری ١٩٧٤ زۆربه ی تابلۆکه م بکه م .

(تابلۆکه ش ژنه کوردێکی بالابه رزو ریك و پێك، به که لپه ل و به رگی عه شیره تی شیروانی به وپه ری خۆرازاندنه وه و تاس و پوشی له سه رو له بێری مه ڕوبزن ده گه ڕێته وه و کارولـه یه کی ساوای ده باوه شه و به ده ستی راستیشی په قره جێکی (سطل) پرشیری هه لگرتووه ... تادوای )

کاك جه وهه ر ته کنیکاریش بوو ، له ٢١ ی حوزه یرانی ١٩٧٤ له یادداشته کانی خۆی دا ده نووسی : ( یه که م رۆژی هاوینه و زۆر گه رم بوو ئه مرۆ چه ند بیروڕایه کم له باره ی شتی هندسه وه بۆ کاك مسعود بارزانی نووسی ، وه ك ته قاندنی بومباو شت، به ده نگ وه به هۆی ئاوێنه و ئاسن فرین و به کارهێنانی گوله ی قاذفه ی ساروخ بۆ ئه م مه به سته و ئاراسته کردنی به ئۆتۆماتیکی به ره و تانك و ئالیاتی دوژمنه وه به زۆر رێگای تریش ، ئه و جۆره ئسلوبه تائێستا که س به کاری نه هێناوه ) .

هەروەها ماوەیەکی زۆریش خەریکی دروست کردنی فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەر بوو نموونەیەکی بچوکی بۆ ئەم مەبەستە دروست کردبوو ، بەلام دەربارەی سەرکەوتنی لە فڕاندنی کۆپتەرەکە زانیاری ئەو تۆ لەبن دەستدا نی یە ئەگەر چی ئەوانەی لەنزیکەوە ئاگادارى ئەو ئیشەی بوون دەڵێن لە کۆتاییدا توانیویەتی بیفڕێنێت.

جگە لەم چەند یادداشتانەی کە لەم چەند ئەلقەیەدا ئامارەی بۆ کراوە وا پێ دەچێ زۆر نووسینی تریشی فەوتابن و بزر بووبن ، یان کەوتبنە لای کەسانێك کە ئێستا بۆیان نەکرێ ئاشکرایان بکا .
بەلام ئەوەی جێگای گومان نی یە چیرۆکێکی تریشی هەیە بەناو نیشانی (ئانەوا) .

---

کوردستانی نوێ ، ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٩٥/٥/٤ ژمارە ٩٧٨ جێگر مێرگەسۆری

# ئه ڵقه ی پێنجه م و کۆتایی

ئه م ده ستنووسه ئه ده بی و هونه ری یه ی جیا له هه مویان ، ده ستنووسێکی پڕ به هاو گرنگی ئه و لاوه جوانه مه رگه یه، که ده بوایه به ر له ئێستا خوێنه ری کورد ئاشنای ده ست و قه ڵه مه که ی ببا و ،له ژێر په رده ی نهێنی و شاراوه دا، که وتبایه په رتوکخانه ی کورده واری وئه و لێهاتوویی و کارامه یه ی جه وهه ر مێرگه سۆری له قاوخی ترازیدیای کاره ساته که ی بنه ماڵه که یان چه که ره ی کردبایه، رۆحی به و شاد ببایه وه که ئۆخه کانی سه ر کاغه زو هیواو ئاواتی نێو نوکه قه ڵه مه کانی له زمانی سڕی و بێ ده نگیدا ، که وتوونه ته نێو دونیای رۆشنبیری و له سه ر گۆره ونه که یدا نه مامی ئاواته کانی روه ر قبله له گه ڵ ئاسۆی ئه مرۆدا ئاوێته بوونه و ناڵه و ئاخ و ئۆفه کانی کونجی به ندیخانه بوونه ته هاواری هه موو که سێك و نووسینه کانی به ئاشنایی له زه ماوه ندی روونا کبیری کوردیدا چلی بوکێنی کردۆته به ر.

نۆسینه کانی ده ستنووسی ئه مجاره ی گه ڕانه به دوای عیشق و سۆزێك که ره نگه ته نها لای خۆی ده ست بکه وێ و هه ستی پێ بکرێ، ده روونه که ی وه ك ده رتایه کی بێ بن، له گه ڵ شه پۆله کاندا گوزارشت له بوونی خۆشه ویستی یه ك ده کات، خۆشه ویستی یه کی خوداوه ندی و خوایی و بێ گه رد، وشه ی (دڵ) و (خۆشه ویستی) و (یار) کۆڵه که ی هاوبه شی نووسینیه کانیه تی، ره نگه ته نیایی و تاریکی به ندیخانه ی (خه لان) و (رایات) و دووری له خۆشه ویسته که ی زیاتر وای کردبێ، کانیاوی ئه وینی و عیشقی جه وهه ر مێرگه سۆری ،وه ك هه میشه به هار له دڵه گه وره که ی هه ڵقوڵابێ ئاسان نی یه مرۆڤ بتوانێ به گه ڕانێکی خێرا... دڵی ئه و نووسه ره دڵداره شی بکاته وه که ده ڵێ: «ئه گه ر دڵێك بۆ یارو ئه وینی لێ نه دات وه ستانی باشتره».

هه موو ساتێك و کاتێکی به ندیخانه ی (خه لان) و (رایات) ئاوێنه بووه بۆ یادگاری یه کانی خۆی له گه ڵ دڵداره که ی و ته نانه ت به وه ش

نه وه ستاوه که به شیعر هۆنینه وه و په خشان نووسین ده ردی دڵی خۆی هه ڵرێژێ و سات و کاته کانی به ندیخانه له گه ڵ یادگاریه کانی خۆشه ویسته که یدا بباته سه ر به ڵکو به فرمێسکی قه تیسماوی نێو چاوه کانی خۆی، زه مینی خۆشه ویستی خۆی و دڵداره که ی تاو داوه و نه ونه مامی دوارۆژی تێدا ڕواندووه.

مێشکه ماندووه که ی نێو به ندیخانه، هه میشه به بۆنی خۆشه ویستی و عیشق مه ست بووه.

سه ره ڕای دووری و لێك ترازان هه میشه خوازیاری ئه وه یه که (که وانه ی ده ستی بازنی ملی یاره که ی بێت و چه په رێ که زیه که ی تۆری دیلی ی بێ).

(په پوله، ئاوێنه ی ئه وینی، به ر له چوار ساڵ، له دڵه وه، چه ند وشه یه ك له کزه ی دڵ و تاریکی به ندیخانه وه بۆ په رستگای ئه وینیم، خواستی خودا نه خۆشم له هجرانت، رۆڵه لای لای، یاری دڵره ق، نرکه ی دڵ بۆ دڵ)

چه ندین نموونه ی په خشانه شیعرو ده ردی دڵی جه وهه ره، که به وه ستایه کی که م وێنه دا هۆنیویه ته وه و له چوارچێوه ی ئه ده بێکی رۆمانسی دا، لاوێکی چیایی به هره و توانای خۆی پێ به دیار خستووه، گواستنه وه ی جه وهه ر حه مه د ئاغا له زیندانی (خه لان) بۆ زیندانی (رایات) زیاتر گڕی خۆشه ویستی یه که ی جۆشتر کرده وه و، له ئه گه ره کانیدا که زیاتر قسه ی نه سته ق و زادی رۆژانی ته نیایی یه که یه تی، حه قیقه تی ئه وینی خۆی و خۆشه ویسته که ی به دیار ده خاو له ژێر ئاسمانی ئه و خۆشه ویستی یه دا گه شبینی ده بێته ده روازه یه کی پان و به رین و له کاروانه دوورو درێژی خۆشه ویستی دا ، ره شبینی به جێ دێڵێ، له گه ڵ ئه وه شدا کونجی به ندیخانه حه زه کانی ده باته دونیای نه مران و له به ر یاره که ی ده پارێته وه. به تکایه کی عاشقانه پێ ی ده ڵێ:

قه بره که م تۆ هه ڵکه نه با له به ر ده رگای ماڵتا بێ
تا گوڵ ئاوات بڕوێ به جۆگه ی ئاوی چاوانت
من که وا له م دونیا بێ وه فایه بێ به ش بووم له تۆ
با له و دنیا به شماو بم له باخ و ته خت و ئه یوانت

***

وه‌ك له‌ هه‌موو ده‌ستنووسه‌ كانی به‌دیار ده‌كه‌وێ، جه‌وهه‌ر مێرگه‌سۆری، نه‌یتوانیوه‌ ته‌نها ئه‌سیری ، عیشق و عیشق بازی بێت و خۆشه‌ویستی دلداره‌كه‌ی ، نه‌یتوانیوه‌ هه‌وینی كوردایه‌تی و خۆشه‌ویستی ولاته‌كه‌ی و تێكۆشانی له‌بیر بباته‌وه‌.

بۆیه‌ به‌شێكی زۆری ئه‌و ده‌ستنووسه‌ی كه‌ نزیكه‌ی (١٥٠) لاپه‌ره‌ی مامناوه‌نجی ده‌بێ و هه‌مووی له‌ نێوان سالانی (١٩٧٢_١٩٧٣) له‌به‌ندیخانه‌كانی خه‌لان و رایات نووسیوه‌، ته‌رخان كردووه‌ بۆ شیعرو په‌خشانی كوردایه‌تی و تێكۆشان و خوێنی شه‌هیدانی كوردستان.

له‌ چیرۆكه‌ شیعری «یازده‌ی ئازاریش ئاهه‌نگه‌» له‌بیست و دوو لاپه‌ره‌دا ، زۆر به‌ژیری و ورده‌ كاریه‌وه‌ تابلۆیه‌كی ئه‌ده‌بی بۆ كۆمه‌لی كورده‌واری كێشاوه‌ و باسی مه‌ینه‌ت و ئازاری منالانی باوك شه‌هیدو بێوه‌ ژنانی ، مێرد بزر بوو ده‌كات و ده‌ردی دلی خۆی ، كردۆته‌ كۆله‌گه‌ی هاوبه‌شی خه‌م و خۆزگه‌ خنكێنراوه‌كانی چینی هه‌ژارو لی قه‌وماوان و جاروباریش به‌ شێوه‌ یه‌كی ته‌نز ئامێزه‌وه‌، هاواری حه‌ق ده‌كات و داوای راپه‌رین و تۆله‌ سه‌ندنه‌وه‌ ده‌كا.

له‌دوو توێی شیعرو نووسینه‌كانیدا، به‌هیوای ئه‌وه‌ رۆژانی به‌ندیخانه‌ ده‌باته‌ سه‌ر ، كه‌ رۆژێك مانگی ئازادی شه‌وه‌زه‌نگه‌كه‌ی رووناك بكاته‌وه‌ به‌ فیعلی جارێكی دیكه‌ له‌گه‌ل براكانی و خزم و دۆستانی دا ببێته‌ كاروانچی ، كاروانی تێكۆشان و له‌ته‌ك نووسینه‌ كانی دا ده‌ست و قامه‌ت لی هه‌لبكات و له‌سه‌نگه‌ری پێشمه‌رگایه‌تی دا خاكی ولاته‌كه‌ی و ئه‌وینی سروشته‌كه‌ی به‌خوێن ئاو بدات.

له‌ شیعرێكیدا ده‌لێ :

ئێستاش كه‌ وا به‌ندم ،بێ ره‌نگ و ده‌نگم
دل و لاشه‌ خۆراكی مێروله‌و هه‌نگم
بۆ راپه‌رین له‌كوێ ی نوستوو ئه‌من زه‌نگم
بۆ دلی دوژمنی خوێن خۆر وه‌كو ژه‌نگم

هه‌روه‌ها له‌شیعرێكی تریدا عاشقی و ئاماده‌یی خۆی ده‌كاته‌ مه‌ـ ـرهه‌م بۆ برینه‌ كانی قه‌ومی كوردو ملی خۆی ده‌كاته‌ قه‌لغان له‌ پێناو تێكۆشان و كوردایه‌تیدا:

عاشق و سه ودا سه رو ئه ویندارى قه ومم
ئیش كه رو مل كه چ له رێ ى فیداكارى قه ومم
ده بمه مه رهه م بۆ خه سته و برینداری قه ومم
ده بێ دنیا بتاسێنێ ئاوداری قه ومم

چه وهه ر مێرگه سۆزی .. له شعرو نووسینه نیشتمانیه كاندا زۆر به راشكاوی بیرو بۆچوون و بیركردنه وه ى ده خاته چوارچێوه ى پێشكه وتنخوازی و ده ڵێ: «سه دان هه نگاو به رزترم له دواكه وتن»

هه روه ها به شیعر به ره رچی ئه و تومه تانه ش ده داته وه كه گوایا له به ر خیانه تكاری و دواكه وتن له كاروانی تێكۆشان به نده كراوه و ده ڵێ:

زۆریان گوت و زۆرم بیست له وكاته ى به ندم
گوایه بۆ ئه رك و خزمه ت له رێدا له نگم... ! !
ئنجا ده ڵێ :
نه ئه ویندارى كه لپه ل و دیمه ن و ره نگم
نه ئه ویندارى پله و سه رمایه و ده نگم
به ڵكو:
من شێت و شه یدای ئازناوی كوردم

به شێكی ده ستنووسه كه بریتی یه له كۆمه ڵێك بابه تی ، وه رگێردراو له زمانی عه ره بی و فارسی بۆ سه ر زمانی كوردی، به تایبه تی ئه و بابه ته فه لسه فیانه ى گه وره نووسه رانی دنیا وه كو فیرده وسی و سه عدی و حافظ و نیتشه و چه ندانی تر، هه روه ها هه ندێك بیروڕای فه لسه فیانه ى خۆشی وه كو چه ند نووسینێكی به پێزو شی كردنه وه تۆمار كردوه، كه به راستی زیره كی و شاره زایی نووسه ر به دیار ده خه ن له بواری فه لسه فه و ده روون ناسی و كۆمه ڵناسیدا.

«ئازایه تی و ژێرده ستی كورد»، نووسینێكه له ڕووی ده روونی یه وه باسی ئازایه تی و پارچه پارچه بوونی كوردستان و ژێرده ستی كوردو بالاده ستی دوژمنانی كورد ده كا، ئه گه ر چی له (١٩٧٣/٣/١)ه وه نووسراوه به ڵام تاكو ئێستا نرخی خۆی هه ر ماوه، چونكه هه مان ئه و هۆكارانه ى كه ئه و ئاماژه ى بۆ ده كات ، وه كو به ربه ست له به رده م ئازادی و رزگاری كوردستان ماون و چاره سه ریان بۆ نه دۆزراوه ته وه.

دوابەشی دەستنووسەکەی یانزە تابلۆیە ، کە بە قەڵەمی رەساس کێشراون، جگە لە دوو (پۆرترێت) کە هی خۆی و (حافظ)ی شیرازی ـن ، ئەوانی تر هەموویان هی کچە شۆخێکی کوردن، رەنگە هەر ئەو کچە بێت کە بوەتە هەوێنی شیعرو نووسینەکانی.

* کوردستانی نوێ یەك شەممە ١٩٩٥/٩/٣ ژمارە (١٠٧٧) هەڵۆ میرگەسوری

بنه ماڵه ی حه مه د ئاغای مێرگه سۆری

ریزه کان له ڕاسته وه بۆ چه پ

ریزی یه که م: حسین، فاخر، حه مه دئاغا، سه عید

ریزی دووه م: اسعد، مجید، جمیل، جۆهر

ریزی سێ یه م: نزار، خلیل سلطان (برازای حه مه د ئاغا)، رشید، خه لۆ برادۆستی



له‌راسته‌وه‌ بۆ چه‌پ

ریزی یه‌که‌م: جه‌نه‌رال مسته‌فا بارزانی

شێخ سلیمان عبد السلام بارزانی

ریزی دووه‌م: له‌ناوه‌راستدا کۆلۆنیل حه‌مه‌د ئاغای میرگه‌سۆری



حەمەد ئاغای مێرگەسۆری
لەگەڵ ولیم ئیلنگ تن دا ١٩٥٥



لەڕاستەوە بۆ چەپ
......، علی عبدالله، سلێمان بەگ دەرگەڵە، حەمەد ئاغا مێرگەسۆری



• لەڕاستەوە بۆ چەپ فارس باوە (دووەم)، فاخر (سێ یەم)، شێخ عەتا تاڵەبانی (چوارەم)، ملازم عبدالرحمن (پێنجەم)



• فاخر لەگەڵ شێخ ڕەزا



فاخر لەگەڵ جوتیارەکانی موسڵ ١٩٥٩



فاخر مێرگەسۆری لە نوگرە سەلمان

. ئه حمه د دلزار    فاخر مێرگه سۆری    علی مولود    زرار سلێمان بگ

له راسته وه بۆ چه پ

ملازم خدر ـ فاخر مێرگه سۆری ـ طارق ابو لحيه . ناوچه ی به رسرین بالەك ١٩٦٦




* فاخر میرگه‌سۆری پلانی ڕزگارکردنی هه‌ندرێن ڕوون ده‌کاته‌وه



ـ سامی عبدالرحمن ـ په‌یامنێری ئۆبزێرڤه‌ر ـ فاخر میرگه‌سۆری ١٩٦٦



* زەماوەندی ملازم ریاض لە سالی ١٩٦٦



١ـ عه لى عه سكه رى   ٢ـ جوهر ميرگه سۆرى



ـ بنگرد... ٥ سه عات به ر له هێرش كردنه سه ر خه لكان به سه ركردايه تى فاخر ١٩٧٠/١٠/٢٢



• ریزی یه‌که‌م فاخر میرگه‌سوری دووه‌می دانیشتوه‌کان، کریم احمد سێ یه‌می دانیشتوه‌کان، زرار سلیمان، ده‌رگه‌له‌ی چواره‌می دانیشتوه‌کان



پیش لیدانی بیره نه‌وته‌کانی که‌رکوک به چه‌ند سه‌عاتیک ١٩٦٩



حەمەد ئاغا ئامیر هێزی سەقین ١٩٦٣



• فاخر لەگەڵ شێخ عوسمانی بیارە

15. *5th from left:* Muhammad Agha Mergasor, Chief of the Shirwan tribe (Barzani) below police post destroyed by Mulla Mustafa in 1945 (1955)



بەکامێرای ولیم ئیلینگتن، ١٩٥٥

حەمەد ئاغا (١)     فاخر     (٢)



حەمەد ئاغا لەگەڵ سەید ئەحمەدی شەمزینی



له لای ڕاست بۆلای چه پ
دووه م ــ ره شید سندی
چواره م ــ فاخر مێرگه سۆری
ره شید سندی یه که م که س بوو له ئابی ۱۹۷۲ دا هه واڵی کوشتنی فاخری
به ساجده به رواری گوتبوو



فاخر (چواره م) له سه ره تای ۱۹٦٤ دا



فاخر لە گوندێکی ناوچەی گەرمیاندا



فاخر لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەی گەرمیان


له پێشوازی گه وره ئه فسه رانی عێراق دا


٦ ـ فاخر له گه ڵ طه شكرچی و علی سنجاری



ـ فاخر لەگەڵ کۆمەڵێک پ.م
لەناوچەی گەرمیان



٢١ـ فاخر لەگەڵ
ئیدریس بارزانی (پێنجەم)
فارس باوە (حەوتەم)
ئەبونا پۆلص بیداری (هەشتەم)
شێخ تەحسین یەزیدی (نۆیەم)



۱۰ ۱ــ فاخر میرگه سۆری ۲ــ شکري الحدیثي (پارێزگاری سلیمانی) ساڵی ۱۹۷۰



ــ فاخر میرگه سۆری له گه ڵ ئه حمه د عبدالقادر ئه قشبه ندی له ئه ورۆزی ۱۹۷۰دا



ـ حبیب فه یلی ـ سامی سنجاری ـ رفیق چالاك ـ فاخر مێرگه سۆری له گه ڵ
ئه رکانی بالیۆزخانه ی سۆڤیه ت
به غدا ١٩٧٠



فاخر له گه ڵ غانم عبدالجلیل پارێزگاری که رکوك



لە ئاهەنگی حەسار ١٩٧٠



ـ فاخر لە کاتی دەست بە سەریدا لە خەلان.

لە راستەوە بۆ چەپ

ابراهیم خەلانی (پ.م)، فاخر مێرگەسۆری، خالد ئاژگەیی بەرێوە بەری زیندان ١٩٧٢



ـ فارس باوه لەگەڵ فاخر میرگەسۆری دا



ـ جەوهەر لە کاتی ڕەسم کردندا



ـ جەوهەر لە بەندیخانەی ڕایات ـ دروست کردنی هەلیکۆپتەر


جمیل حەمەد ئاغا


رەئوف حاجی قادر



•جەوهەر مێرگەسۆری لە بەندیخانەی رایات ۱۹۷۲ .



رشید حمدمین شیروانی ـ فاخر مێرگەسۆری ـ ئەحمەد بەگ. دوای کوژرانی جەمیل



تەرمی ئەسعەد حەمەد ئاغا هەردوو پێ ی زنجیر کراوە
لە رۆژنامەی (الثورة) ٦/٤/١٩٧٥ وەرگیراوە



• فاخر مێرگەسۆری لە بەغدا کاتی دانوستانی نێوان حکومەت و شۆرش ١٩٧٠ .



سردار حسين حه مه د ئاغا له دايكبووى ١٩٥٦ له ميرگه سور، كورى شه هيد (حسين)ه كه له سالى ١٩٦٢ له به رگرى كردن له بارزان دا شه هيد كرا.

سردار له روژى ٢٢\٢٢/٨/١٩٩٦ له شه رى سيده كان به ديلى به ده ستى هيزه كانى بارزانى شه هيد كرا.

الى ابو شفان المحترم

بعد التحية

١) يرجى عدم تحرك في بناء دار لحين عودتي لانه غير ضرورية .

٢) بخصوص شبابيك والابواب :- اخبروا اوسطه لارسالها اليكم حسب الشروط ، او ارسلوا احد الاوسطوات لجلبها ،

٣) لا مانع من شراء اسبيندار في سكرا .

٤) اقتصدوا بالفلوس في جميع النواحي .

٥) ان عدم سماح لكم بالذهاب الى اربيل لشراء الابواب والشبابيك يدل على تمييز العنصري كما هو الحال بالنسبة لزنوج السود في امريكا حيث انهم محرومون من جميع الحقوق في حين يخدمون حكومة الامريكية اكثر من غيرهم الابيض .

تنفذوا اوامر المسؤولية وتوجيهاتهم ،

والدي يقبل عيونكم .

ابو هندرو

٤/١٩

له به‌ندیخانه ١٩٧٢ ،

نامه‌یه‌کی شه‌خصی به‌ خه‌تی فاخر میرگه‌سۆری

# انشقاق خطير داخل الحزب الديمقراطي الكردستاني

## ٣ من زعماء الحزب يحذرون البارزاني من التمادي في سياسته المشبوهة

الراصد

## مذكرة الزعماء الثلاثة تسجل ٢٢ اتهاما ضد البارزاني وتتهمه بالتآمر على الحزب الديمقراطي الكردستاني وقتل عشرات الثوار

● ٥- الصقتم التهم الباطلة بمخلصي الحزب والثورة دون الاستناد الى اي قانون يبرر مواقفكم هذه .. كما آل اليه مصير المناضل فاخر ميركه سوري عضو اللجنة المركزية الذي اختفى باشارة منكم دون محاكمة او تحقيق او حتى اعلان عن التهمة التي اسندتموها اليه ، ولم تجرا قيادة حزبية حتى الآن ان تحاسبكم لا بل ان تفاتحكم على هذا التصرف . فهل هذا يتفق وكرامة الانسان ..؟ وهل وجدت مثل هذه الاعمال في كل ثورات العالم ..؟ وهل هذا تصرف قائد ورئيس حزب ديمقراطي لقادته ورفاقه في السلاح والنضال ..؟

ان ما حصل للاخ فاخر وغيره يحدث لعشرات الناس في كردستان على ايديكم وايدي معتمديكم

یادداشتێکی سێ ئەندامی سەرکردایەتی پارتی، باس لە بێ سەروشوێن کردنی فاخر دەکەن لە (الراصد) بڵاوبوەتەوە ١٩٧٤

# جماهير اربيل تدين جرائم التمرد المنهار

روعت جماهير اربيل يوم امس الاول بسماعها نبأ الجريمة الفظيعة التي ارتكبها قادة التمرد المنهار بحق الشخصية الكردية البارزة (( حمد اغا مركه سوري )) وابنائه وعدد من المناضلين .

ومساء امس استقبلت اربيل الباسلة جثث الشهداء الطاهرة .

فقد وصل من قرية ( بابكر اوى ) الواقعة قرب رايات، جثمان كل من (( حمد اغا مركه سوري )) وثلاثة من ابنائه هم جوهر ورشيد واسعد . وكذلك جثماني الرفيق خليل سلطان ( قلندر ) وهو عضو في الحزب الشيوعي العراقي منذ عام ١٩٥٩ ، ومحمد سليم گوردي .

لقد كان الشهيد حمد اغا من المساهمين الاوائل في الحركة الكردية وساهم في الانتفاضات التي قام بها شعبنا الكردي في الثلاثينات والاربعينات وحكم عليه في اعقاب سقوط جمهورية مهاباد الديمقراطية بالسجن المؤبد . ولم يغادر السجن الا بعد انتصار ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ . ورزيء باستشهاد ابنه الكبير الشيوعي الشجاع الرفيق حسين ، كما اغتيل ابنه جميل من قبل جلاوزة الملا قبل اعوام : اما مصير ولده فاخر فلا يزال مجهولا حيث كان معتقلا في سجن رايات الذي تشرف عليه الزمرة المنهارة .

وكان الشهيد صديقا لحزبنا الشيوعي العراقي ، وربى اولاده على حب الحرية والنضال ضد الاستعمار والرجعية ، وفي سبيل الحقوق القومية لشعبنا الكردي ومن اجل الحكم الذاتي .

وقد ترك نبأ استشهاده واولاده والرفاق الاخرين – بهذا الشكل المروع – حزنا عميقا لدى جماهير اربيل وكل الجماهير الكردية التي تعرف في حمد اغا مركه سوري ابنا بارا للشعب الكردي ، قضى اعوامه الخمسة والثمانين في خدمة الشعب واهدافه القومية العادلة .

المجد والخلود للشهداء حمد اغا مركه سوري واولاده ورفاقه الشجعان .

والخزي والعار للقتلة المجرمين

طريق الشعب...١٩٧٥/٤/٤

## حادث اليم



وقع اعتداء اثيم على حياة السيد جميل نجل محمد اغا ميركه سوري وشقيق السيد فاخر ميركه سوري ظهر يوم الاحد المصادف ١٤-٢-١٩٧١ في مدينة اربيل وهو في طريقه الى عمله . ولا شك ان المعتدين سينالون جزاءهم العادل .

ان الشهيد من عائلة مشهورة بنضالها الوطني والقومي في منطقة بارزان ، تحت زعامة المناضل الكبير مصطفى البارزاني .

## شكر على تعزية

يشكر السيد محمد اغا ميركه سوري جميع الذوات الاعزاء الذين تفضلوا وشاركوه في مصابه الاليم بانتقال نجله المرحوم - جميل - الى جوار ربه سواء من شارك في تشييع الجثمان او حضر مجلس الفاتحة في ميركه سور او ابرق او ارسل معزيا العائلة على الكارثة الاليمة راجيا رب العالمين ان لا يصيبهم اي مكروه . وانا لله وانا اليه راجعون .

التآخي....١٩٧١/٢/٢٧

## الرفاق الجزراوي وحداد والحمداني والعامري يتفقدون الحاج عمران وكلالة وبارزان

# الكشف عن مزيد من جرائم الزمرة العميلة المنهارة

## اتخذت مفارز من قواتنا المسلحة مواقعها امس في مناطق الحدود مع تركيا وايران وتوزعت على المنافذ والمخافر والنقاط على الحدود

وتوجه اعضاء من البعثتين العسكريتين الجزائرية والايرانية الى المناطق الحدودية في حاج عمران وقلعة دزه وبنجوين للوقوف على الاجراءات المتخذة لتنفيذ قضايا الحدود .

ومن ناحية اخرى تفقد عدد من اعضاء القيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي مناطق عديدة من كلالة الى حاجي عمران ومناطق اخرى في منطقة الحكم الذاتي واكدوا عزم قيادة الثورة على اتخاذ اجراءات واسعة لدعم وتطوير المنطقة والبدء بمرحلة جديدة من مراحل البناء الايجابي . وفي الوقت نفسه كشف النقاب عن المزيد من الجرائم البشعة للزمرة العميلة المنهارة .

واكد نبأ لبعثة وكالة الانباء العراقية ان القيادة العميلة للتمرد قد اعدمت فاخر حمه ميركه سوري عضو ما يسمى باللجنة المركزية مع ابيه واشقائه التسعة بعد اعتقالهم منذ عام ٧٢ في سجن رايات الرهيب وكانت طلائع قواتنا المتقدمة قد عثرت امس الاول اثر دخولها منطقة كلالة على جثث هؤلاء وهم حمد اغا ميركه سوري خال الخائن ملا مصطفى ووالد فاخر سوار اغا احمد من ابناء عمومة الملا وكانت ايديهم وارجلهم قد ربطت بسلاسل حديدية وقد اخترقت مؤخرات رؤوسهم عدة طلقات من الرصاص .

ويقول النبأ ان سعيد وصيف وهو ما يسمى بالمشرف العام على السجن قد قام بعملية الاعدام التي تمت في السادس والعشرين من الشهر الماضي بالاشتراك مع محمد خالد البارزاني وبايعاز من القيادة العميلة عند هروبها من رايات .

وكان فاخر ميركه سوري على خلاف مع الملا على اثر دفعه لعناصر من زمرته بقتل شقيق فاخر المدعو جميل ميركه سوري في اربيل وقيامه بعد ذلك باعتقال فاخر في سجن رايات منذ ٧٢ مع ابيه واشقائه .

الجمهورية.....١٩٧٥/٤/٤

# ناوەڕۆك

سوپاس و پێزانین :

زۆر سوپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەم کەلە نووسینی ئەم کتێبەدا بە زانیاری یان بە چاوپێکەوتن یارمەتیان دام:

١. مام جەلال
٢. بهاد الدین نوری
٣. شێخ عەتا تالەبانی
٤. د. عز الدین مصطفی رسول
٥. فاروق مەلا مستەفا
٦. مستەفا چاورەش
٧. د. عبد الستار طاهر شریف
٨. کمال شاکر
٩. احمد شریف
١٠. ابو دلشاد
١١. ممتاز حەیدەری
١٢. کاك عەزەرەش
١٣. کریم حاجی قادر
١٤. ژمارەیەك لە پێشمەرگەی دێرین و کەسایەتی تر

هەروەها سوپاسی:

١. بەڕێزان هەلۆ ـ ئاسۆ ـ مسعود ـ یادگار ـ شیروان، دەکەم کە بە کۆمپیوتەر کتێبەکەیان بۆ چاپ کردم.

سوپاسی تایبەتیشم بۆ:

کاك بەختیار سوار ئاغای شیروانی کە زۆر یارمەتی دام لە کۆکردنەوەی زانیاریەکان، بەڵام بەداخەوە لە ڕۆژی (٣١)ی ئابی ١٩٩٦ دا بێ سەر و شوێن کراو کتێبەکەی نەدیت.

## ئەم کتێبە

دیرۆکی تاوانێکی گەورەو
قەتلوعام کردنی بنەماڵەیەکی
تێکۆشەرو کوردپەروەر
دەگێڕێتەوە

ململانێ و ڕکابەری سیاسی و
حزبی و عەشایری نێوان مەلا
مستەفای بارزانی و فاخر
مێرگەسۆری باس دەکا چەندین
ڕازو نهێنی دیوی ناوەوەی شۆڕشی
ئەیلول و گەمە سیاسی و
پەیوەندیە شاراوەکانی پشت
پەردە دەخاتە ڕوو.